




USAID | العراق
من الشعب الامريكي



MercyCorps
Be the change

# پلاندانان و پلاندانانی ستراتیژی


ئامادەکردنی مافپەروەر

هوگر چەتۆ


2015






Internews
Local voices. Global change.



Mercy Hands
For Humanitarian Aid
جمعية أيادي الرحمة الأنسانية



# خشتەی ناوەڕۆک

# پوختەیەک لەسەر پرۆژەکە:

بەرفراوانکردنی بەشداریی لە ڕێی کۆمەڵگەی مەدەنییەوە (بەشدارییپێکردن) بریتییە لە پرۆژەی پتەوکردنی بەشداریی کۆمەڵگەی مەدەنی/هاووڵاتی کە سێ ساڵ دەخایەنێت. پرۆژەکە لە لایەن ئاژانسی ئەمریکی بۆ گەشەسەندنی نێودەوڵەتی (USAID) دارایی دەکرێت و لە لایەن ڕێکخراوی مێرسی کۆرپ و یەکێتیی هاوبەشەکانی-ەوە جێبەجێ دەکرێت کە بریتین لە ئینتەرنیوس (Enternews)ی ئەمریکی، بنکەی نێودەوڵەتی بۆ یاسای ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی (ICNL)، ڕێکخراوی دەستەکانی مهیرەبانی (MH) و ڕێکخراوی فریاکەوتنی میللی (PAO).
ئامانجی پرۆژەکە بریتییە لە کارکردن لەسەر سیستمە دیموکراسییەکان عێراق بەرەو بەشدارپێکردنی زیاتر و چووستی زیاتر لە ڕێی کاری کۆمەڵگەی مەدەنییەوە بە شێوەیەکی بەردەوام بە مەبەستی قووڵکردنەوەی بەشداریی هاووڵاتیان لە بوارەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسییدا. لە سەرجەم قۆناغەکانی پرۆژەکەدا، (بەشدارییپێکردن) جەخت دەخاتە سەر پشتگیریی دەستەپێشخەرییەکان بۆ: بەرفراوانکردنی بەشداریی چالاکی هاووڵاتیان لە پرۆسەی گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی و ئابووری و دیموکراسیی عێراقدا، و پتەوکردنی توانا ڕێکخراوی و دەستگاییەکانی چەند ڕێکخراوێکی سەرەکیی کۆمەڵگەی مەدەنی. هەروەها بە مەبەستی زیاترکردنی کاریگەری کۆمەڵگەی مەدەنی لەسەر دروستکردنی بڕیارەکانی سیاسەتی گشتیی و چاکترکردنی ئەو ژینگە یاسایی و ڕێکخراوی و تواناییەی کە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی کاری تێدا دەکەن، هەروەها بۆ سوود وەرگرتن لە پسپۆڕی و شارەزایی کۆدەستەیی زیاتر لە نۆ ساڵ کاری ئەو ڕێکخراوانەی لە بواری هاوکاریی مەدەنیی عێراقییەکان کار دەکەن، ئەو عێراقییانەی کە جەنگەکان زیانێکی گەورەی پێگەیاندوون.

# چاپتەری یەکەم

## پێناسەی پلاندانان چییە؟

پرۆسـەی پێشـبینی کردنـی ئایینـدە و ئامادەکـاریی ڕێوشـوێنەکان بـۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەم ئاییندەیە.

بەم شێوەیە، پلاندانان بریتییە لە:

- پرۆسەیەکە لە چەند قۆناغێک یان چەند هەنگاوێک پێک دێت.
- ئامادەکارییە بۆ ئاییندە لە ئێستادا.
- دیـــاریکردنی بوارەکـــانی ســـوودوەرگرتن لە ســـەرچاوەکانی بەردەست بە مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجەکانی ڕێکخراوەکە.
- کـاریکی هزریـی دانـا و ڕێکـوپێکە بـۆ چالاکیی جۆراوجۆری کارگێڕیی.



کەواتە، چەمکی پلاندانان: پلاندانان چـالاکییەکە تێیـدا کـارگێڕی بڕیـار لەســـەر ئەو کـــارانە دەدات کە دەیەوێت بیکات، چی بکات، کەی، لە کـوێ، لە لایەن کـێ، و ســەرچاوە پێویســـتەکان کامـــانەیە بـــۆ ئەنجامدانی ئەم کارە؟

## بایەخی پلاندانان بریتییە لە:

1- پلاندانان ئەرک و پەیامی سەرکردایەتی ئاسان دەکات، و رۆڵی کارمەندەکان دیاری دەکات.
2- دەبێتە هۆی بەفیڕۆ نەدانی سەرچاوەکانی بەردەست.
3- دیدگە (رؤیا، Vision)ی بەڕێوەبەران و کارمەندان ڕۆشن دەکاتەوە و توانای ئەنجامدانیان زیاتر دەکات.
4- دەبێتە مایەی کەمبوونەوەی هەڵەی بڕیاری هەڕەمەکی، و هاوکاری دەکات لە دۆزینەوەی ڕێگەچارەی بەدیل (جێگرەوە، Altenerative) بە شێوەیەک کە گەرەنتییان زیاترە و مەترسییان کەمترە.
5- قۆناغەکانی کارەکە و هەنگاوەکان پێویستەکان دیاری دەکات بۆ گەیشتن بە ئامانجە دانراوەکان.
6- پلاندانان ڕێگە خۆش دەکات بۆ دانانی پێوەری بابەتییانە بۆ هەڵسەنگاندن.
7- هاوکار دەبێت لە بەدیهێنانی ئارامیی دەروونی بۆ کارمەندان.
8- ڕێگە خۆش دەکات بۆ دۆزینەوە و ناساندنی گرفتەکان و هەر لادانێک لە ئاییندەدا ڕوودەدات، هەروەها ڕێگە خۆش دەکات بۆ چارەسەرکردن و ڕاستکردنەوەیان.



9- هاوکار دەبێت بۆ دۆزینەوەی خاڵەکانی بەهێزی و لاوازیی ڕێکخراوەکە.
10- ڕێگە خۆش دەکات بۆ خۆلادان لە ئەگەری ئاڵوگۆڕی رەوشەکان لە ئاییندەدا و یارمەتیدەر دەبێت بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ ڕێچکەی ڕووداوەکان.

## جۆرەکانی پلاندانان:

**بە گوێرەی ماوە (کات)**

| کەمتر لە ساڵێک | ١ -٣ ساڵ | سێ ساڵ و زیاتر |
|---|---|---|
| پلانی کورتخایەن | پلانی مامناوەندی | پلانی درێژخایەن |

ڕاهێنانی کرداریی: بەشداربووان دابەش دەکرێن بۆ سێ گروپ، و هەر گروپێک وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە: (جیاوازی چییە لە نێوان پلانی جێبەجێکردن و پلانی ستراتیجی)؟

### وەڵام: پلانی ستراتیجی و پلانی جێبەجێکردن

| ئاستی باڵای کارگێڕی | پلاندانانی ستراتیجی | پلانی گشتیی وەزارەتی پەروەردە و خوێندن |
|---|---|---|
| ئاستیی مامناوەندیی کارگێڕیی | پلاندانان لە ئاستی مامناوەندیی کارگێڕییدا (چالاکیی تەرخانکردنی سەرۆک) | پلان بۆ بەرنامە (مەنهەج)ی خوێندن و گەشەپێدانی |
| ئاستیی سەرپەرشتیاریی | پلانی جێبەجێکردن (دانانی خشتە) | پلان بۆ گەشەپێدانی مەنهەجی عەرەبی یان مامۆستاکان. |

# پلاندانانی جێبەجێکردن چییە؟



کێ ئەم کارە دەکات؟ (فەرمانبەران).
چۆن کارەکە جێبەجێ دەکرێت؟
یەکەی کارگێڕی دەتوانێت چەند کار بکـــــات لە مـــــاوەیەکی زەمەنـــــی دیـاریکراودا؟ (کـاتژمێر، ڕۆژ، مانـگ، ساڵ).
لە کوێ کارەکە ئەنجام دەدرێت (ئایا لە یەکەی أ، یان ب، یان ج)؟
ئەم کارە کەی تەواو دەکرێت؟

## پـیـوەرەکانی پلانداانانی باش چـیـیـە؟

پێوەری یەکەم: تەبا بێت لەگەڵ بەها گشتییەکان و بەها کرداریيەکانی مرۆڤ.

پێوەری دووەم: لەو پەیام (رسالة، Mission)ەوە سـەرهەڵبدات کە لە خود و دیدگەیەکی دیاریکراوەوە هەڵقوڵا بێت.

پێوەری سێیەم: ڕەنگدانەوەی ئەولەویـاتی مـرۆڤ بێت، بە شـێوەیەک کە پلاندانانەکە ڕەنگدانەوەی ڕاسـتەقینەی ئەولەوییاتەکانی مرۆڤەکان بێت.

پێوەری چوارەم: هاوسەنگ بێت، لایەنێکی پلاندانان باڵزاڵ نەکات بەسەر لایەنێکی تردا، جەخت نەخاتە سەر ئامانجێک و ئامانجەکانی تر فەرامۆش بکات.

بۆ نموونە: کاتی تەرخانکردن بۆ کاتبەسەربردن (ترفیە) باڵزاڵ نەبێت بەسەر ژیانتدا لەسەر حسابی کاتی تەرخانکراو بۆ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان.

پێوەری پێنجەم: واقعی بێت، بتوانرێت بە ئاسانی جێبەجێ بکرێت و چالاکییەکان دیاریکراو بن، هەروەها کات و توانای بەردەست و توانای کەسەکە ڕەچاو بکات.

**ئەی چارەنووسی خەونەکانمان؟**

ئایا خەونەکانمان بەشێکن لە پرۆسەی پلاندانان؟

**سوودەکانی پلاندانان:**

- ئامانجی کۆتاییت ڕوون دەبێت لەلات.
- متمانەت بەوە دەبێت کە کاری رۆژانەت ئامانجێکی هەیە.
- دەتوانیت بە شێوەیەکی بابەتیانە (موضوعی، objective) شیکار (تحلیل، Analysis) بکەیت.
- بیرکردنەوەت بە شێوەیەکی مەنهەجی دەبێت.
- دەتوانیت سوود لە خاڵەکانی بەهێزیی کارەکەت یان پیشەکەت وەربگریت.
- خاڵەکانی لاوازیی کەم دەکەیتەوە.
- کارەکان جێبەجێ دەکەیت.

## هاوکێشەی "سەرکەوتن" چییە ؟
## ڕاهێنانێکی کرداریی



**ئامانجی ڕوون و دیاریکراو + پلاندانانی دروست + جێبەجێکردن بە ئامرازی گونجاو + هەڵسەنگاندن و پێداچوونەوە = بەدیهێنانی ئەنجامەکان**

**پرۆسەی پلاندانان (عملية التخطيط** The Planning Process)

پرۆسەی پلاندانان بایەخێکی گەورەی هەیە ئەگەرچی تەنانەت داڕشتنی پلانی ستراتیجی بۆ داڕشتنی نووسراوێک بێت. هەر بۆ خۆی دەبێت بە وانەیەک و شتی لێ فێر دەبین. پلاندانان دەرفەتێک دەبێت بۆ هێزی شاراوەی ناوخۆی ڕێکخراوەکە، و هانی ئەدای باشتر دەدات لە کارکردن.

## پلاندانان بۆ پرۆسەی پلاندانان

ئەگەر بڕیارت دا خۆت سەرقاڵی پلاندانانی ستراتیجی بکەیت، لەبیر بێت:

- جەخت بکەوە لەوەی دەستگاکە ئامادەیە بۆ پرۆسەی پلاندانان و ئاستی جۆراوجۆری دەستگاکەت پێی ڕازی بووە.
- هەوڵ بدە مەزەندەی ئەو کاتە بکەیت کە هەر کەسێک پێویستی پێیەتی، و هەوڵ بدە هێندەی بکرێت کەمی بکەیتەوە.
- مەزەندەی وزەی وەبەرهێنراوی هەر تاکێک بکە لە پرۆسەکەدا.
- بزانە کێ پرۆسەی پلاندانان بەڕێوە دەبات، و کێ بڕیاری کۆتایی دەدات.
- بە ڕوونی ئەو کەسانە دیاری بکە کە پێشبینی دەکەیت بەشداری بکەن لە قۆناغەکانی پلاندانانـدا (بۆ نموونە، ئایا دەتەوێت سوودمەند (الزبون، کڕیار، بەکاربەر) بەشداری بکات لە ستراتیجی دارایی‌دا؟)
- جەخت بخەرە سەر ڕێزگرتن لە نهێنی و تـوخمە گشتییەکان لە پرۆسەی پلاندانان.
- کاتێک هەڵبژێرە بۆ پلاندانان کە گونجاو بێت لەگەڵ چالاکییەکان و پابەندێتییەکان (التزامات)ی ڕێکخراوەکەت.
- بگەڕێ بۆ هەندێک تەکنیک بۆ تەحەدی کردنی دەستگا قازانج-نەویستەکەت.
- پێشوەخت گەشە بدە بە سیستمەکانی چاودێری.

- دەستگایەک ئەم خشتەیەی خوارەوەی دارشتووە بۆ پرۆسەی پلاندانان:

| هەنگاوەكان | كەی | بەرپرس | بەشداران | ماوەی كۆبوونەوە |
|---|---|---|---|---|
| 1- رەزامەندی لەسەر هەنگاوەكانی پلاندانان | هەفتەی یەكەم | فلان (بە بەشداریی راوێژكار) | بەڕێوەبەری گشتیی، سەرۆك، بەڕێوەبەرێكی ئاست بەرز | دوو كاتژمێر |
| 2- دابەشكردنی زانیاری لەسەر پلاندانان | هەفتەی یەكەم | فلان (بە بەشداریی راوێژكار) | فۆرم بەسەر ئامادەبوان دابەش دەكرێت | |
| 3- پێداچوونەوەی پەیام و دیدگە | یەكەم رۆژەكانی هەفتەی دووەم | فلان (بە بەشداریی راوێژكار) | دەستەی كارگێڕی، بەڕێوەبەری جێبەجێكار، كارمەندان، هاوبەشەكان | دوو كاتژمێر |
| 4- شیكردنەوەی سواتSOWTو لاپەڕەی كارPortfolio | بەشی دووەم لە هەفتەی دووەم | فلان (بە بەشداریی راوێژكار) | دەستەی كارگێڕی، كارمەندان، خۆبەخشان | پێنج كاتژمێر |
| 5- ئامانجە ستراتیجییەكان و هەڵبژاردەكان | یەكەم رۆژەكانی هەفتەی سێیەم | سەرۆكی دەستەی كارگێڕی (بە بەشداریی راوێژكار) | دەستە، كارمەندان، سوودمەندان/ بەكاربەران | پێنج كاتژمێر |
| 6- پلاندانانی دارایی | دوایین رۆژەكانی هەفتەی سێیەم | سەرۆكی دەستەی كارگێڕی (بە بەشداریی راوێژكار) | دەستە، كارمەندان، سوودمەندان/ بەكاربەران | پێنج كاتژمێر |
| 7- رەشنووسی | یەكەم | بەڕێوەبەری | بەسەر هاوبەشەكانی | كۆبوونەوە |

| یەکەمی پلانەکە | رۆژەکانی هەفتەی چوارەم | گشتیی (بە بەشداریی راوێژکار) | رێخراوەکەدا دابەش دەکرێت | پێویست ناکات، سەرنجەکان بە نووسراو بۆ بەرێوەبەر بەرز دەکرێتەوە |
|---|---|---|---|---|
| 8- پێداچوونەوەی رەشنووسەکە و ئامادەکردنی نوسخەی کۆتایی | کۆتایی هەفتەی چوارەم | بەرێوەبەر (بە بەشداریی راوێژکار) | سەرجەم ئەوانەی سەرنجیان هەبووە لەسەر پلانی کار | خولی کۆتایی هەفتە |
| 9- جێبەجێکردنی پلانەکە و پێداچوونەوە | ساڵانە خولێکی دوو رۆژی بۆ پێداچوونەوەی ساڵانە | سەرۆك (بە بەشداریی راوێژکار) | هاوبەشەکان | کۆبوونەوەکانی کۆتایی هەفتە |

ئەم پلانە تێروتەسەلە بوار دەرەخسێنێت بۆ رێکخراوی قازانج-نەویست لە ماوەی مانگێکدا پرۆسەی پلاندانان تەواو بکات، بەڵام بە گوێرەی رێکخراوەکەش ئەمە دەگۆرێت. پلاندانانی ستراتیجی پرۆسەیەکی بنەرەتییە بەڵام نابێت پەلە بکرێت لە ئامادەکردنیدا.

ئایا پێویستە رێکخراوەکەت دەست بە پرۆسەی پلاندانانی ستراتیجی بکات؟

- ئەمەی خوارەوە ئەو پرسیارانەیە کە دەتوانین لە رێکخراوەکەی بکەین. و بە گوێرەی ئەنجامی پرسیارەکان بڕیار بدرێت لەسەر پلاندانان یان وازهێنان لێی.

- **وەڵامی گونجاو بۆ دەستگاکەت هەڵبژێرە:**

| | راست<br>هەڵە |
| --- | --- |
| دەستگاکەت بە تەواوەتی سەربەخۆیە لە دەرکردنی بڕیارەکانیدا | |
| کەسە سەرەکییەکان (دەستە، کارمەند، سوودمەند) پابەندن بە پلاندانان | |
| بە هۆی قەیرانێکی گەورەوە تواناکانمان زۆر دادەبەزێت | |
| دەتوانین بایەخ بە بەڕێوەبردنی رۆژانەی دەستگاکەمان بدەین | |
| دەستگاکەمان زوو گەورە بوو، تەنێ بەڕێوەبەر ئاگای لە هەموو کاروبارەکانە | |
| دڵخۆش دەبین ئەگەر بتوانین بەرنامەی داهاتوومان جێبەجێ بکەین، بە بێ ئەوەی باسی بەرنامەی داهاتوو بکەین | |
| هەمووان دەزانن بۆچی لە دەستگاکە ئیش دەکەن و بۆچی دەستگاکەمان دامەزراندووە | |
| پێویستبوونی خزمەتگوزارییەکان تا دێت زیاد دەکات بەڵام سەرچاوە بەردەستەکان بەشی جێبەجێکردنی هەموو پێویستییەکان ناکات | |
| کارگێڕیی باڵای دەستگاکە لەبەر هەندێک بابەتی بنەڕەتیی، تووشی دابەشبوون بووە | |
| زۆربەمان بڕوامان وایە پلاندانانی ستراتیجیی دروستە وباشە بەڵام جیهانەکە خۆی نالۆجیکییە | |
| نازانم ئاخۆ ساڵی داهاتوو لێرە دەمێنمەوە یان نا بۆیە ئاییندەی دەستگاکە ڕوون نییە | |
| کەشێکی پر لە تامەزرۆیی هەیە بۆ دانانی پلانی ئاییندەی دەستگاکە | |

ئەگەر ١٠ وەڵام بەسەر دەستگاکەتدا بچەسپێت، کەواتە ئێوە ئامادەن دەست بکەن بە پلاندانانی ستراتیجی. پێشنیار دەکەین دەست بکەن بە کار و بگەڕێنەوە بۆ ئامۆژگارییەکانی ئەم نامیلکەیە. بەڵام ئەگەر ١٠ دانەیان نەچەسپا بەسەر دەستگاکەتدا کەواتە زەحمەتە بتوانن کار لەسەر پلاندانانی ستراتیجی بکەن لە ئێستادا و باشترە چاوەڕێی کاتی گونجاو بکەن.

- یان ئامادەیی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی زەحمەتییەکی زۆر لە کاتی پرۆسەکەدا.
- تکایە بیرۆکەکانی ئەم نامیلکەیە لەگەڵ هاوڕێکانت تاوتوێ بکە سەبارەت دەستپێکردنی پلانی ستراتیجی.
- هیوادارم سەرکەوتوو بن لە کارەکانتان بەو هیوایەی لە ئاییندەدا پەیوەندییمان هەبێت.

# چاپتەری دووەم

## پلاندانانی ستراتیجی چییە؟

پلانـــی ســـتراتیجی بـــریتییە لە نـــامیلکەیەکی نووســـراو کە وەک ڕێبەرنامەیەکی کار بۆ ماوەی درێژخـایەن بەکاردەهێنرێت (لە ٣ تـا ٥ سـاڵ) بـۆ دەسـتگایەک. پلانێک بەرهەم دێت کە هەوڵ دەدات وەڵامـی ئەم پرسیارانە بداتەوە:

- بۆچی ڕێکخراوەکە/دەستگاکە؟
- چی دەکات؟
-بەرەو کوێ؟
- چۆن بگاتە ئەو شوێنە؟

### پلانی ستراتیجی چی تێدایە ؟

پلانی ستراتیجیی سەرکەوتوو ئەم خاڵانە لەخۆدەگرێت:

1- دیدگە (ڕؤیا، vision)ی ڕێکخراوەکە، پەیامەکەی و بەهاکانی.
2- شیکردنەوەی دامەزراوەییانە کە هاوبەشەکانی ڕێکخراوەکە دیاری دەکات، لەگەڵ خاڵەکانی لاوازی و بەهێزی و دەستکەوتەکانی.
3- ئەو ئامانجانەی کە ڕێکخراوەکە هەوڵ بۆ بەدیهێنانیان دەکات لە سێ تا پێنج ساڵی داهاتوودا.
4- خشتەی کات بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانج و مەبەستانە.
5- هەڵسەنگاندنی ئەنجامەکان، ئەم پلانە نووسراوە زۆر گرنگە بەڵام پرۆسەکەش لە داڕشتن و لە تەواوکردنی ئێجگار پڕبایەخە.

## دیدگە (الرؤیا، The Vision)

هەنگاوی یەکەم لە دارِشتنی پلانی ستراتیجی سەرکەوتوو بریتییە لە دیاریکردنی دیدگەی ڕێکخراوکە. ڕێککەوتن لەسەر دیدگە کارێکی ئاسانە لە هەندێک دەستگا/ڕێکخراو، بەڵام لە هەندێکی تر کاتی زۆر دەوێت. چەندین دەستگای قازانج-نەویست هەمان دیدگەیان هەیە:

- دیدگەی ئێمە بریتییە لە باڵادەستیی ئاشتی
- دەمانەوێت منداڵان دڵخۆش بکەین.
- دەمانەوێت جیهانێک دروست بکەین کە هەمووان لە کۆمەڵگەی مەدەنیدا بژین

- **خەسڵەتەکانی ڕاگەیاندنی دیدگە:**

- دەڕوانێتە ئایندەی درێژخایەن.
- کورتە و پوختە.
- هەمووان بە ئاسانی لە ماناکەی تێدەگەن.
- باسی قۆناغێکی سەقامگیر دەکات.
- دەشێت چەند ڕێکخراوێک هەمان دیدگەیان هەبێت.

- **ئایا دەتوانن دیدگەی خۆتان بە گوێرەی ئەم پێوەرانە بنووسن؟**

## بەهاکان و فەرهەنگ ( Values And Culture )

پێویستە دیدگەی ڕێکخراوەکە ڕەنگدانەوەی بەها بنەڕەتییەکانی بێت. ئایا ئەوەت ڕەچاو کردووە کە خەڵک چۆن سەیری خۆت و دەستگاکەت/ڕێکخراوەکەت دەکەن؟ ئایا سەیری ئەو بەهایانەت کردووە کە دەستگاکەت بە یەکگرتوویی دەهێڵێتەوە؟ دەتوانرێت بەها دامەزراوەییەکان بنووسرێنەوە، بەڵام مەحاڵە جێبەجێ بکرێن ئەگەر کارمەندەکان ڕێزیان لێ نەگرن. بەها دامەزراوەییەکان بریتین لە بابەتی وەک دەرفەتی یەکسان، و وەرگرتنی بڕیار بە هاوبەشی یان کارایی. ئەو ڕێکخراوەی قازانج-نەویست بێت و هەندێک بەهای دیاریکراوی هەیە ئەوە دەبێت بە ڕێکخراوێک کە دەتوانێت کارەکانی جێبەجێ بکات و سیاسەتەکانی لەسەر ئەم بەهایانە دابمەزرێنێت. تا زووتر بەهاکان دیاری بکەین، کاری دەستگاکە لە ئاییندەدا باشتر دەبێت. زۆر گرنگە لیستەیەک دابڕێژین بەو بەها و پرەنسیپانەی کە دەستگاکە بڕوای پێیان هەیە و ئنجا وردە وردە بگۆڕێن بۆ فەرهەنگ و کلتووری دەستگاکە و لە بنیاتنانی سیاسەتەکاندا بکرێن بە بناغە.

ئەو بەهایانە کامانەن کە دەستگا قازانج-نەویستەکەی تۆ بڕوای پێیان هەیە و دەتوانن پشتی پێببەستن؟

ڕەنگە بەها شەخسییەکانت بابەتی جۆراوجۆر لەخۆ بگرێت وەک کرانەوە و لێبوردەیی و ڕاستگۆیی. تۆش بەشێکیت لە دەستگاکەت نە تەنها لەبەر پسپۆڕی و تواناکانت لە بواری کارەکەت بەڵکو هەروەها لەبەر ئازایەتیی و بوێریی شەخسییت. تۆ و دەستگاکەت و ئەوانەی تر بەهای هاوبەشتان هەیە.

ئایا بەهـا شەخسـییەکانت دەنووسـیتەوە ئەوانەی کە گونجـاوە لەگەڵ ڕێکخراوەکەت و خۆت و ڕێکخراوەکەت بڕواتان پێی هەیە؟
ڕێکخراوێکـی پۆڵەنـدی، قـازانج-نەویسـت، بە گـوێرەی بەهاکـان و خـاڵە بەهێزەکانی ئەمەی خوارەوەی ڕاگەیاندووە:
مـرۆڤ، سـەرچاوەی سـەرەکیی دەسـتگاکەیە، بـۆیە بـایەخێکی گەورە دەدەیـن بە هەڵبژاردنـی کارمەنـدەکانمان و سیسـتمی بەڕێـوەبردنی کارمەندان، و هەوڵی بەردەوام و چڕ دەدەین بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی مەعریفە و کارزانیەکانیان. پتەوکردنی توانای گروپی کارمەندان دەبێتە مـایەی جێبەجێکردنـی ئەرکەکـانی دەسـتگاکە بە باشـترین شـێوە. ئەم ئامـانجە سـەرەڕای کـاری یەکەکـانی دەسـتگاکە بـریتین لە چوارچێـوەی کاری "بنکەی فەرمانبەران"ی سەر بە دەستگاکە.

## **پەیام و ئەرک** (**المهمة**، The Mission)

زۆر گـرنگە دیـدگە و بەیـانەکەی ڕوون بـن بـۆ ئەو پەیـامەی دەیگەیـنین. بەیانی پەیام (بيان المهمـة) ئەو بـابەتەیە کە دەسـتگاکەت لە دەسـتگاکانی تـری خـاوەن هەمـان دیـدگە جیـا دەکـاتەوە. دەشـێت بگەیـن بە هەمـان مەبەست و هەمان دیدگە بەدی بهێنین بەڵام بە شێوازی جیاواز.

**پێویسـتە دەسـتگاکەت بڕیـار بـدات کە کـامە ڕێگە (واتە کـامە پەیـام) بەکاردەهێنێت بـۆ گەیشـتن بە دیـدگەکەی، بـۆ ئەوەی دەسـتگاکە بە یەکگرتوویی بمێنێتەوە پێویستە تێگەیشتن لە دیـدگە سـەرجەم ئاسـتە جۆراوجۆرەکان بگرێتەوە.**

کاتێـک پرسـیار دەکرێـت پەیـام و ئەرکـی رێکخراوەکەتـان چیـیە و رێکخراوەکەتان دەیەوێت چی بەدەست بهێنێت، پێویستە وەڵامەکان ئەم خالانە لەخۆبگرن:

پشـتگیری و گەشـەپێدانی کـۆمەڵگە لە رێـی بەشـداریکردن لە چـالاکییە کـۆمەڵایەتی و زانیـاری وفەرهەنگـی و لێکـۆڵینەوە پەروەردەییەکـان کە کـار دەکەن بـۆ گەشـەپێدانی بـازاڕ و بڵاوکـردنەوەی دیموکراسـی و کلتووری مافی مرۆڤ لە کوردستان.

## رۆڵی بەیانی ئەرک و پەیام (المهمة ، mission) چییە؟

**پێویستە وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە:**

- ئـێمە کێـین؟ و خزمەتـی کـێ دەکەیـن؟ ( هەروەهـا، لە کـوێ و چۆن؟)
- ئامانجی گشتیی دەستگاکە روون دەکاتەوە.
- دەربڕی بەهاکانی رێکخراوەکەیە.
- کورتە و داینامییکییە.
- تایبەتە بە سەرجەم دەستگاکە
- کارلێک دەکات لەگەڵ گۆڕاوەکان و رەوشەکان..
- ناوبەنـاو پێـداچوونەوەی دەکرێـت و ئەگەر پێویسـت بـوو دەستکاری دەکرێت.
- جەخت دەخاتە سەر بەکاربەر.
- جەخت دەخاتە سەر ئەنجام نەوەک چالاکییەکان.

**نموونە :** دەستگایەک لە هەنگاریا دیدگەیەکی ڕوونی پێشکەش کرد بەڵام بەیانی پەیامی لەبیر چوو، ئەمەش ڕیسواییەکی گەورە بوو لە سەرتاسەری وڵات.

دیدگەی دەستگاکە تایبەت بوو بە هاوکاریی ئەو منداڵانەی کە تووشی ڤایرۆسی ئایدز-سیدا بوون، هاوکارییان بکات تا نەمرن و لە ژیان بەردەوام بن. ئەندامانی ڕێکخراوەکە و لایەنگرەکانی پابەند بوون بە هاوکاریی دەستگاکە لەبەرئەوەی هاوکاریی دارایی پێشکەش بەو منداڵانە دەکرد کە تووشی ڤایرۆسی ئایدز بوون.

لیژنەی وەرگرتنی بڕیار لە دەستگاکە پێی وایە کە پێویستە هاوکاریی منداڵانی تووشبوو بکرێت، بەڵام هەروەها، هاوکاری ئەو منداڵانەشی دەکرد کە تووشی دەردەکە نەبوون ئەوانەی کە ژیانیان کاریگەری لەسەر دەبێت لە ئەنجامی منداڵە تووشبووەکان، و دەستگاکە کاری دەکرد بۆ سنووردانان بۆ تەشەسەندنی نەخۆشییەکە. کاری پێویست بۆ هەر یەکێک لەو دوو ئەرکە، جیاوازە.

بۆ یەکەمیان پێویستە هەموو ئەو هاوکارییانەی دەستگاکە پێی دەگات بیدات بەو منداڵانەی کە تووشی ڤایرۆسەکە بوون، بەڵام ئەوەی دووەم پێویستی بە وەبەرهێنانی کۆشس و سەرچاوەی دارایی هەیە بۆ رۆشنبیرکردنی منداڵە تەندروستەکان.

ئێمە دەبێت لەسەر پرسیارە بنەڕەتییەکان ڕێک بکەوین پێش ئەوەی دەست بکەین بە پلاندانان و جێبەجێکردن.

**بە گوێرەی ئەو خەسڵەتە دیاریکراوانە، لەم خانەیەدا بەیانی ئەرک و پەیام، بنووسە**

## 2- ئەنجامدانی شیکردنەوەی دامەزراوەیی (اجراء التحليل المؤسساتي Conducting Organizational Analysis)

**پێداچوونەوەی وانەکە لەگەڵ ڕوانین لە ئاییندە**

زۆر جار باشترین ئەنجاممان دەست دەکەوێت لە ڕێی شیکردنەوەی دەستگایەکی دیاریکراو بە شێوەیەکی سروشتی و نافەرمی بۆ نموونە لە کاتی چا خواردنەوە لە کاتێکدا کە هەمووان هەست بە ئازادی ڕادەربڕین دەکەن و ئارامن. ئەم زانیارییانە زۆر گرنگ و پێویستە بە هەمان شێوە لە کاتی پلاندانانەدا کەشێکی ئارام باڵی کێشا بێت.

بۆ زانینی ئەوەی هاوبەشەکان (الشركاء) کێن دەتوانین خشتەی شیکردنەوە دابڕێژین. پێویستە شیکردنەوەی بەرنامەکان (تحليل برامج Portfolio) پشت بەم سێ توخمە ببەستێت کە هاوکاریمان دەکەن لە داڕشتنی بۆچوونەکان سەبارەت دەستگاکە، و بۆ ئەوەی باشترین ئەنجاممان دەست بکەوێت لە پرۆسەی پلاندانان.

**<u>کێ بایەخ دەدات، شیکردنەوەی هاوبەشەکان؟</u>**

**<u>ئایا بیر لەوانە دەکەیتەوە ئەوانە کێن کە بایەخ بە دەستگاکەت دەدەن؟</u>**

زۆر گرنگە لایەنگرەکان دیاری بکەیت، و بۆچی پشتگیری دەستگاکەت دەکەن. ئاییندەی دەستگاکەت بە پلەی یەکەم پشت بەو تاکەکەس و دەستانە دەبەستێت کە بایەخ بە چالاکییەکانت دەدەن. هەر یەکێکیان پاڵنەری خۆی هەیە و باکگراوندی جیاوازی هەیە. بۆیە زۆر گرنگە بۆچوونەکانیان ڕەچاو بکەیت کاتێک پلان دادەنێیت بۆ دەستگاکەت. بەو

کەسانە دەگوترێت هاوبەش الشرکاء"Stakeholders"، بۆ نموونە کاتێک هاوبەشەکانمان دیاری دەکەین پێویستە سوودمەندەکان/بەرکارەکان بە هاوبەش دابنێین وەک ڕێکخراوەی قازانج-نەویست. کاریگەری کارێک یان خزمەتگوزارییەکی دەستگاکە چییە لەسەر پیشەیەک یان بازرگانییەک، لەسەر حکومەت، کۆمەککارەکان، قوتابخانەکان، یان زەویی کشتوکاڵی، تاد. کاتێک لیستەی ناوی هاوبەشەکانت تەواو کرد، ئەوسا وا باشترە جارێکی تر پرسیارەکە بکەیتەوە بۆ ئەوەی کەست لەبیر نەچێت.

**ڕێکخراوێکی قازانج-نەویست لیستەیەکی دانا بۆ هاوبەشەکانی و بە گوێرەی بایەخەکەیان پۆلێنی کردن بۆ:**

1-سوودمەند لە خزمەتگوزارییەکان (کڕیار، بەکاربەر، هتد).
2-حکومەتی خۆجێی
3-کارمەندانی دەستگاکە
4-ئەندامانی دەستەی کارگێڕی
5-کۆمەککارەکان
6-خۆبەخشەکان

**هاوبەشە سەرەکییەکانی خۆت دەستنیشان بکە:**

ئەو جیهانەی تێیدا دەژیت: هاوبەشەکانت. وەک تاکەکەس و وەک کۆمەڵ، جەماوەری تۆن و بریتین لە کۆمەڵێک سوودمەند و وەبەرهێنەری دەستگاکەت.

## شیکردنەوەی "سوات"SWOT

خاڵەکانی بەهێزی، خاڵەکانی لاوازی، دەرفەتەکان، و ئاستەنگەکان

هیچ شیکردنەوەیەک سەرناگرێت بە بێ وردبوونەوە و ڕەچاوکردنی فاکتەرە ناوخۆیی و دەرەکییەکانی دەستگاکە. شیکردنەوەی سوات ئامرازێکی باشە بۆ ئەم مەبەستە و خشتەیەکە لە "خاڵەکانی بەهێزی، خاڵەکانی لاوازی، دەرفەتەکان (یان تواناکان)، و ئاستەنگەکان (یان مەترسییەکان)".

### خاڵەکانی بەهێزی و لاوازی بریتین لە فاکتەری ناوخۆیی دەستگاکە.

کاتێک داوا لە ڕێکخراوێکی قازانج-نەویست دەکرێت خاڵەکانی بەهێزی و لاوازی خۆی دیاری بکات ئەوسا ئاساییە لیستەی جۆراوجۆر بەرهەم بهێنن. زۆر جار خاڵەکانی بەهێزی بریتین لە: کاری پێکەوەیی سەرکەوتوو، مێژوویەکی پڕ لە دەستکەوت، بەڕێوەبەرێکی سەرنجڕاکێش، پسپۆڕی شایستە، شوێنی باش، و چالاکیی جۆراوجۆر. ڕەنگە خاڵەکانی لاوازییش بریتی بن لە: دارایی بەش ناکات، ژمارەی خۆبەخشەکان کەمە، گەیاندن و پەیوەندی نێو دەستگاکە لاوازە، تاد.

دەرفەتەکانیش بە گشتیی بریتین لە: هەبوونی تەمویل، بایەخی کۆمەڵگە، چاکترکردنی جۆری خزمەتگوزارییەکان، پەیوەندی و گەیاندنی نێودەوڵەتی باش، چالاکیەکانی دەستگاکە زۆر پێویستن، هەبوونی سیاسیی باش بۆ جێبەجێکردنی چالاکییەکان. لیستەی مەترسی و ئاستەنگەکانیش ڕەنگە ئەمانە لەخۆبگرێت: زۆریی ئەو دەستگایانەی لەو مەیدانە کار دەکەن، تەمویلی حکومەتی نزیکە کۆتایی بێت، پێشکەوتنی تەکنەلۆجی زۆر خاوە لەناو ڕێکخراوە، ژینگەی ئابووریی هەژارە.

**راهێنانێکی کرداری :**

**پ/ ئایا دەتوانیت شیکردنەوەی سوات SWOT بۆ ڕێکخراوەکەت بکەیت و گرنگترین خاڵەکانی ڕێکخراوەکەت باس بکەیت؟**

| ژینگەی ناوخۆیی | |
|---|---|
| خاڵەکانی بەهێزی | خاڵەکانی لاوازی |
| | |
| ژینگەی دەرەکی | |
| مەترسییەکان (ئاستەنگەکان) | دەرفەتەکان (تواناکان) |
| | |

| | |
|---|---|
| لێرەدا گرنگترین پرۆژەکانی دەستگاکەت بنووسە (پرۆژەی بەناوبانگ، یان: پرۆژەی ئەستێرە، Star Projects). ئەمانە ئەو پرۆژانەن کە دەبنە مایەی بەدیهێنانی پەیام و ئەرکی دەستگاکە و دەتوانرێت گەشەیان پێبدرێت، دینامیکی و میللی و داهێنەرانەن. | لێرەدا ئەو پرۆژانە بنووسە کە جێی گومانن Questioned. ئەم پرۆژانە ئەگەریان هەیە ببن بە پرۆژەی بەناوبانگ، بەڵام تا ئێستا ئەمە نەسەلمێنراوە |
| لێرەدا ئەو پرۆژانە بنووسە کە پارەی باشیان تێدایە Cash Cow Projects . دەتوانرێت پشت بەم پرۆژانە ببەسترێت، پرۆژەی سوودبەخشن و تەمویل پەیدا دەکرێت بۆیان و بەڕێوەبردنیان هیچ مەترسییەکی تێدا نییە. | لێرەدا پرۆژە مردووەکان بنووسە Dead Projects. ئەم پرۆژانە پێویستیان بە وەبەرهێنانی زۆر هەیە لە سەرچاوەی دارایی و کارگێری زۆر هەیە و داهاتەکەشیان شتێکی ئەوتۆ نییە. |

## شیکردنەوەی بەرنامەی دەستگا ( PORTFOLIO ANALYSIS )

شیکردنەوەی بەرنامە هەنووکەییەکانی دەستگاکە جۆری سێهەمە لە شیکردنەوەی دامەزراوەیی. ئەم جۆرە شیکردنەوەیە وەڵامی ئەم پرسیارانە دەداتەوە: ئێمە ئێستا چی دەکەین؟ ئایا ئەوەی دەیکەین دروست و ڕاستە؟

دوای ئەنجامدانی شیکردنەوەی سوات، پێویستە بچین بۆ شیکردنەوەی بەرنامە هەنووکەییەکان. شیکردنەوەی بەرنامە هەنووکەییەکان ڕێگە خۆش دەکات بۆ پێداچوونەوەی بەرنامەکان بە گوێرەی چەند پێوەرێک. پێویستە بە چاوی ڕەخنەگرانە بڕوانین پرۆژەکانی دەستگاکەمان و بڕیار بدەین ئاخۆ دەبنە مایەی بەدیهێنانی ئەرک و پەیامەکە و ئاییندەی دەستگاکە.

**دوای تەواوبوونی ئەم شیکارییە، ئەم پرسیارانەی خوارەوە هاوکاریت دەکات بۆ دیاریکردنی هەنگاوەکانی داهاتووت:**

- ✓ ئایا دەکرێت ئەو پرۆژانەی جێگەی گومانن بگۆڕین بۆ پرۆژەی ئەستێرە؟
- ✓ ئایا واز لە پرۆژە مردووەکان بهێنین و جەخت بخەینە سەر پرۆژە ئەستێرەکان و پرۆژەی جێی گومان؟
- ✓ ئایا لە بنەڕەتەوە پرۆژەیەک هەیە کە بتوانین پێی بڵێین پرۆژەی ئەستێرە؟ ئەگەر وا نییە، ئەی پێشبینی دەکەیت کام پرۆژە ببێت بە پرۆژەی ئەستێرە؟
- ✓ ئایا ڕەچاوی ئەوەت کردووە کە خزمەتگوزارییەکان وا باوە بە ئاسانی پێشبینییان بکرێت ؟

- ✓ ئایا چیت دەست دەکەویت لە بەڕێوەبردنی پرۆژەی ئەستێرە و پرۆژەی جێی گومان؟
- ✓ دەتوانیت چی فێر ببیت لە چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ئەو پرۆژانەی پارەی باشیان تیدایە؟
- ✓ ئایا بەرنامەکانی هاوولاتیان ڕەنگدانەوەی بەهێزی دەستگاکەت و دەرفەتەکانییەتی؟

## دیاریکردنی ئەولەوییات

کاتێک پلانی ستراتیجی دادەنێیت بۆ دەستگاکەت، ڕەنگە واب اشتر بێت بگەڕێیتەوە بۆ ئەنجامەکانی هەردوو شیکردنەوەی سواتSWOT و بەرنامە هەنووکەییەکانی بەردەست Portfolio Analysis. هەوڵ بدە بە باشترین شێوە سوود وەربگریت لە هاوبەشەکانت، و خاڵە بەهێزەکان و دەرفەتەکان بەکاربهێنیت و ڕێگەچارە بدۆزیتەوە بۆ زاڵبوون بەسەر خاڵە لاوازەکان و مەترسییەکان.

ڕەنگە نەتوانیت جەخت بخەیتە سەر سەرجەم بوارەکانی شیکردنەوەکە. زۆر گرنگە لیستەی ئەولەوییەت دروست بکەیت لە لیستە دووروودرێژەکانت. باشترە نەچیتە قووڵایی هەموو ئەو بابەتانەوە کە تاوتوێ کراون چونکە ڕەنگە ئەمە ببێتە مایەی وشکبوونەوەی سەرچاوەکانی بەردەستت.

دانانی لیستەی ئەولەوییات کارێکی زەحمەتە، چونکە دەبێت واز لە هەندێک کاروبار بهێنیت کە خۆت یان خەڵکی تری دەرەوە بە دڵیانە و مەبەستیانە. بەڵام ئەمە کارێکی گرنگە و پێویستە هەموو ڕێکخراوێک

ئەنجامی بدات کە دەیەوێت ئەنجامی باشی دەست بکەوێت و جەختی سەرچاوەکانی بخاتە سەر هەندێک بواری دیاریکراو. بابەتی تاوتوێکان بریتین لە بناغەی شیکردنەوەی ورد و دۆزینەوەی خاڵەکانی بەهێزی و دەرفەتەکان. بڕیارەکانیش پێویستە جەخت بخەنە سەر ڕوانینی قووڵی تاکەکان و سوودمەندەکان و بەکاربەرەکانی دەستگاکە. بە شێوەیەک کە پێویستییەکانی ئێمە تەبا بێت لەگەڵ پێویستییەکانی سوودمەندەکان. ئەمەش ئەو بناغەیەیە کە دەبێت کاری لەسەر بکەین کاتێک لیستەی ئەولەویات دادەنێین. دەتوانیت ناو دەستگاکەت و سەرچاوە بەردەستەکان بگەڕێیت (پارە، کارزانیی، تاکەکان) و ئنجا بڕیار بدەیت و ئەولەویاتەکان دیاری بکەیت.
تاوتوێ و ئەنجامی لەسەرخۆی ئەم ڕاهێنانە قووڵە هاوکاریی ڕێکخراوەکەت دەکات بۆ دۆزینەوەی هەندێک هەڵبژاردەی ستراتیجی.

## هەڵبژاردە ستراتیجییەکان

لەژێر ڕۆشنایی شیکردنەوەکانی پێشوودا، دەتوانیت دەست بکەیت بە پرۆسەی هەڵبژاردە ستراتیجییەکان کاتێک پلانی ستراتیجی بۆ دەستگا قازانج-نەویستەکەت دادەنێیت. ئەمانەی خوارەوە هەندێک لەو پرسیارانەن کە ڕێکخراوی قازانج-نەویست لە خۆی دەکات پێش دانانی ئامانج و مەبەستە ستراتیجییەکانی:

- ئایا درێژە بە گەشەمان دەدەین و بەدواداچوونی دەکەین؟
- دەبێت گروپی بەئامانجگیراو (مستهدف) کێ بێت؟
- ئایا ئەو کارانە ئەنجام دەدەین کە پێویستە ئەنجامیان بدەین؟

- ئایا خواردنی زیاتر بدەین بە لانەوازەکان، یان خزمەتگوزاریی زیاتر بۆ سوودمەندەکانمان دابین بکەین؟

- ئایا ئەو پارانەی کۆی دەکەینەوە لەسەر لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی دۆزینەوەی چارەسەر بۆ شەکرە خەرج بکەین؟ یاخود یارمەتی ئەو کەسانە بدەین کە شەکرەیان هەیە بۆ ئەوەی ژیانێکی باشتر بژین؟

- ئایا بەردەوام بین لە پشتبەستن بە تەمویلی حکومەتی خۆجێی؟

- ئەگەر ژمارەیەکی زۆر دەستگای هاوبەش هەبێت لە ناوچەکە، ئایا هاوکاریی زیاتر بکەین لەگەڵیان؟

- پێویستیی جۆراوجۆر لە ئارادایە، ئایا کار بکەین بۆ چارەسەرکردنی هەموویان؟

- ئایا نەوجەوانان رۆشنبیر بکەین سەبارەت سێکسی پارێزراو(الجنس الامین SAFESEX) یان هەوڵ بدەین ئەم رۆشنبیرییە بخرێتە ناو مەنهەجی خوێندن؟

- ئایا نووسینگەی هەرێمایەتی دروست بکەین بۆ ئەو بەرنامانەی هاوشێوەی بەرنامەکانی ئێمەیە، یان باشتر وایە لەم رێکخراوەدا کار لەسەر بەرنامەی نوێ بکەین؟

- کۆمەککارە هاوبەشەکان دەیانەوێت پشتگیریی لە خۆپارێزی دژی مادەی هۆشبەر بکەن، ئایا ئەمە رێگەیە بگرینە بەر بۆ پەیداکردنی تەمویل؟

- ئایا کاتی ئەوە هاتووە دەستەکە تازە بکەینەوە و هەندێک پسپۆڕ و شارەزای نوێ بهێنین؟

- ئایا واز لە نووسینگەکەمان بهێنین کە دەکەوێتە ناوەڕاستی شار و بگوازینەوە بۆ کەناری شار کە لەوێ کرێ هەرزانترە؟

- ئەگەر ڕێژەیەکـی زۆر بێکـاریی هەبێـت، بـۆچی کارەکانمـان لەگەڵ خۆبەخشەکان چڕ نەکەینەوە؟
- شێوازی گونجاو چییە بۆ زیاترکردنی بەشداریی ئەندامانی دەستەی کارگێڕی لە چالاکییەکانی دەستگاکەدا؟

ئەو پرسـیارانەی سـەرهەڵدەدەن و تاوتوێکانیـان بـخەنە نـاو هەنـدێک خـانەی گشـتییەوە (بـۆ نمـوونە، تواناکـان، دامەزراوەیـی، گەشـەی سەرکردایەتی، کاروباری تەمویل، دابەشکردنی سەرچاوەکان، هاوکاری و هاوبەشی، تەبایی لەگەڵ بەها و دیدگە و ئەرک و پەیام، هتد).
لەم ئاسـتەدا، ئەو بڕیـارانەی دەیـدەیت کـار دەکەنە سـەر ئاڕاسـتەی ڕێکخراوەکە بۆ سێ تا پێنج ساڵی داهاتوو، بۆیە، هەموو ئەو کاروبارانە بە هەند وەربگرە کە لە هەڵبژاردەی ستراتیجیدا حسابیان بۆ دەکرێت، و پێویسـتە شـیکردنەوەی جۆراوجـۆر ئەنجـام بـدەیت بـۆ جەختکـردنەوە لەوەی ئەو ڕێگەیەی هەڵیدەبژێریت، باشترین ڕێگەیە بۆ ڕێکخراوەکەت.

## ئامانجە ستراتیجییەکان (**الغايات الاستراتيجية** ، Strategic Aims)

لەژێر ڕۆشنایی دیدگە و ئەرک و پەیام و ئەنجامی شـیکردنەوەکاندا، تۆ ئامـادەیی تەواوت دەبێـت ئامـانجە سـتراتیجییەکەت دابڕێژیـت، هـیچ ئامـانجێکی سـتراتیجی راسـت یـان هەڵە نییە، ئەو ئامـانجەی بگونجێـت لەگەڵ دەسـتگایەک ڕەنـگە نەگونجێـت بـۆ دەسـتگایەکی تـر. ئەگەر دوو دەسـتگا ئەرک و پەیامەکەشـیان هەمـان شـت بێـت ئەوا ئامـانجە سـتراتیجییەکانیان کە پشـت دەبەسـتێت بە هەڵسـەنگاندنی فـاکتەرە

ناوخۆیی و دەرەکییەکان (شیکردنەوەی سوات) جیاواز دەبێت، بۆیە لە دەستگایەکەوە بۆ دەستگایەکی تر جیاوازە.
ئامانجە ستراتیجییەکان بریتین لە مەبەست یان ئامانجە گشتییەکانی ڕێکخراوەکە.
هەندێک ئەولەوییەتی دیاریکراو دەمێنێتەوە بە گوێرەی هەڵبژاردە بەردەستەکان. ئامانجەکانیش ئەو ڕێگەیەمان بۆ دەستنیشان دەکات کە ڕێکخراوەکە دەتوانێت بە شێوەیەکی نموونەیی بیگرێتە پێش. ئامانجە ستراتیجییەکان:
- ئاڕاستەیەکی ڕۆشن پیشان دەدەن.
- واقعیین.
- جەخت دەخەنە سەر ئەنجامەکان.

- **پێشنیار**

پێکهێنانی بنکەی زانیاری بۆ ڕێکخراوە قازانج-نەویستەکان (ICNL ) (بنکە) و بارەگاکەی لە هەولێر دەبێت، و دەبێت بە ژێدەر (مەرجەع) بۆ ئەو ڕێکخراوە کوردستانییانەی قازانج-نەویستن، و ئامانجەکەی لەژێر ڕۆشنایی ئەرک و پەیامەکەیدا بریتییە لە:
-ئاسانکردنی دەستگەیشتنی ڕێکخراوە قازانج-نەویستەکان بە زانیاری لەسەر یاساکان و سەرچاوە داراییەکان و ڕێکخراوە هاوبەشەکان.

-بەرزکردنەوەی ئاستی پیشەیی ڕێکخراوە قازانج-نەویستەکان لە ڕێی مەشقەوە.

## 4-ئامانجەکان (الأهداف، Objectives)

کە دەڵێین ئامانج واتە "غاية" کە بە ئینگلیزی دەگوترێتgoalو وشەی ئامانجەکان بۆ "هدف"ی عەرەبی وobjectiveی ئینگلیزی کە مەودایەکی دووتری هەیە لە ئامانجەکان.

کاتێک ئامانجە ستراتیجییەکانت دیاری دەکەیت ئەوسا بە ئاسانی دەتوانیت بگەیت بە ئامانجەکانت. هەندێک دەستگا بۆ پلاندانان پشت بە ئامانجەکان دەبەستێت بەڵام هەر زوو بۆی دەردەکەوێت ئەم شێوازە تەنها سەرکەوتنی کورتخایەن بەدەست دەهێنێت، پێویستە ئامانجەکانت و ئامانجی ستراتیجیت تەبا بن لەگەڵ ئەرک و پەیامی رێکخراوەکەت.

ئامانجەکان بریتین لە پلانی تێروتەسەلی کار و کاتبەندن بۆ ئامانجە ستراتیجییەکان، زۆربەی جار لە دووتوێی پلانی ساڵانەدا دەبن، هەر ئامانجێکی ستراتیجییش چەند ئامانجێکی هەیە.

- **پێویستە ئامانجەکان ئەم خەسڵەتانەیان هەبێت:**
  - دیاریکراو بن - Specific
  - بپێورێن - Measurab
  - بتوانرێت بهێنرێنە دی - Attainable
  - واقعی و گونجاو بن - Realistic
  - کاتیان بۆ تەرخان کرابێت - Timed

**هەروەها دەبێت خۆت ئامادە بکەیت بۆ هەستی نەرێنی هەندێک لە هاوڕێکانت لە بەرامبەر ئەو ئامانجە ڕوونانەی دەتوانرێت بپێورێن، ڕەنگە نارەزاییەکانیان لەم خاڵانەدا بێت:**

- بەرپرسیارێتی
- گۆڕانکاری
- تێگەیشتن لەوەی هەندێک لە چالاکییەکان ناگونجێن لەگەڵ ئەرک و پەیامی رێکخراوی قازانج-نەویست بەڵام دەیانهێڵێتەوە چونکە بەرپرسەکە زۆر باشە.
- ئەرکەکان ڕوونن، ئەی ئاسانتر نییە بڵێین بەرپرسیارێتییەکە دەکەوێتە ئەستۆی هەمووممان.
- دواکەوتن لە دوایین ژوان.
- وازهێنان لە ئارامی لەبەر کارگێڕییەکی کاراتر.
- تێگەیستن لەوەی هەندێک پرۆژە ناچنە ناو خانەی کارەکانی دەستگاکە، بەڵام بۆ ئەوەی تەمویل ڕابکێشین پێویستە هەمووممان لەم ترس و دڵەڕاوکەیە تێبگەین و شێوازی نوێ بدۆزینەوە بۆ کارکردن لەگەڵ ئەو تیمەی کاری لەگەڵ دەکەین.

یەکێک لە گرنگترین سوودەکانی دەستنیشانکردنی ئامانجەکان بریتییە لە زیادبوونی تەرکیز، بەم شێوەیە دەزانیت چیت لێ داوا کراوە و پشکداریی تۆ چەند دەبێت بە شێوەیەکی گشتیی. لە بەدواداچوونی قازانجە درێژخایەنەکاندا دەستگاکان هەست بە سەرکەوتن دەکەن.

کاتێـک ئامانجەکـان دیـاریکران، ئامـانجی روون و پێـوراو، ئەوسـا دەبێت بیانگۆڕین بۆ کار و جێبەجێیان بکەین و ئنجا پێشوەخت پلان دابنێین بۆ پرۆسەی هەڵسەنگاندن.
دوای دەستنیشـانکردنی ئامانجەکـان پێویسـتە جەخـت بخەینە سـەر چۆنیەتی بەدیهێنانیـان. چیرۆکێکی کۆن هەیە سـەبارەت ناپلیۆن، کە گوێی لە سـەرکردەی سوپاکانی دەگرت بە بێ دەنگی کاتێک ئەوان باسی پلانی جۆراوجۆریان بۆ دەکرد کە چۆن پەلاماری بروسیا یان ئیسپانیا بدەن. ئنجا کە تەواو دەبوون پرسیاری لەسەر پلانەکانیان دەکرد "چەند ئەسپت پێویستە بۆ جێبەجێکردنی پلانەکەت"، زۆرجار ئەم وردەکارییانەیـان بیـر دەچـوو، و پلانەکەیـان شکسـتی دەهێنـا چـونکە هێنـدەی پێویسـت ئەسـپیان نەبـوو. بـۆیە، باشـتر وایە چەنـد پلانێکی کار دابنێیت کە ئامانجەکەت دەهێننە دی بۆ ئەوەی نەکەویتە ناو گرفتی ئاوها و بۆ ئەوەی بتوانین ئەنجامەکان بەدەست بهێنیت.

**ئەمەی خوارەوە چەند نموونەیەکە لەسەر چالاکی و کاری پەیوەست بە ئامانجی ٢:**

1-دامەزراندنی رێکخەری مەشق

دوایین وادە (کات، موعد): ناوەڕاستی کانونی دووەم ٢٠٠٣.

**بەرپرس :بەڕێوەبەری بنکە، بودجە:** -------------

2- مەشقدەرەکان لە بواری هەڵسەنگاندنی ئەدا تاقی بکرێنەوە

دوایین وادە: ناوەڕاستی شوباتی ٢٠٠٣

**بەرپرس :بەڕێوەبەری بنکە**

بــودجە: ----------- بــۆ هەر کۆبــوونەوەیەکی هەلســەنگاندن، پسپۆڕان

3- هەڵمەتی نیشتمانیی ڕاگەیاندن بۆ مەشق

بودجە: ----------- کۆ دەکرێتەوە بۆ تەمویلی هەڵمەتەکە

4- تەمویلی هەڵمەتی ڕاگەیاندن

دوایین وادە: ناوەڕاستی کانونی دووەمی ٢٠٠٣

**بەرپرس: بەڕێوەبەری بنکە**

5- ئەنجامدانی مەشق بۆ ماوەی 100 کاتژمێر

بەرپرسەکان: مەشقدرەکان

کۆ، ژمـارە: بەڕێوەبەرانی ئاسـتی مامناوەندی لە ڕێکخـراوە قـازانج-نەویستەکان

شوێن: 10 ناوچە بە لای کەمەوە

بودجە: -----------

6- پێوەرەکـانی مەشــق: پێویســتە بە لای کەمەوە ١٥ بەڕێــوەبەری ئاستی مامناوەندیی ڕێکخراوە قازانج-نەویستەکان بەشداری بکەن لە هەر مەشقێک. هەروەها پێویستە پسپۆڕی چـاودێری ئامـادە بێت بـۆ هەڵسەنگاندنی ئاستی ئەدای مەشقدەرە نوێیەکان.

دوايين وادە: ماوەی نێوان ١ ی ئازار ٢٠٠٣ تا ١٥ كانونی يەكەمی ٢٠٠٣

**بەرپرس: ريكخەری مەشق و مەشقدەرەكان**

بودجە : ------------ كە بۆ ٢٠٠٣ بڕيار دراوە

7- هەڵسەنگاندنی ئامانجی ژ ٢

دوايين وادە: ١٥ تا ٣١ ی كانونی يەكەم ٢٠٠٣

بەرپرس: ريكخەری مەشق، بەرێوەبەر و مەشقدەرەكان

بەشداران: سەرجەم بايەخدەران بە پرۆژەكە

بـــودجە: ------------ بـــۆ داپۆشـــينی تێچـــووی نـــامە و كۆبوونەوەكان

**دواجار، پرسياری ئەوە لە خۆت دەكەيت كە كەی ئەنجامەكان دەبينيت؟**

5- هەڵسەنگاندنی ئامانجەكانت Evaluating your Results

بە شـێوەيەكی روون بەرپرسـيارێتييە كەسـييەكان بـۆ هەمـوو كارەكـان ديـاری دەكرێت، وەک لە نموونەكـانی پێشـوو باسـمان كـرد. زۆر گـرنگە چـاودێری دەسـتكەوتی هاوڕێكانـت بكەيـت كە پەيوەسـتن بە پـرۆژە جۆراوجۆرەكـانی سـاڵەكە. وا بـاوە هەڵسـەنگاندنێكی گشـتيی بكرێـت لە كۆتايی بەرنامەكاندا يان لە كۆتـايی سـاڵەكەدا بـۆ جەختكـردنەوە لەوەی دەســـتگاكە ســـەركەوتوو بـــووە لە بەديهێنـــانی ئەنجامەكـــان. ئەو

هەڵســەنگاندنەی کە کەمترینــی تێــدەچێت بــریتییە لە هەڵســەنگاندنی نــاوخۆیی، کە چەنـد کەسـێک پـلانە بنەڕەتییـەکە بەراورد دەکەن لەگەڵ ئەنجـامە کۆتاییەکـان. هەنــدێک دەســتگا لە ویـلایەتە یەککگرتووەکـان گرێبەست دەکەن لەگەڵ پسپۆڕی تایبەتمەندی سەربەخۆ بۆ ئەنجامدانی هەڵســەنگاندن بــۆ ئەوەی هەڵســەنگاندنەکە تــا ئەوپەڕی بابەتییــانە و پسپۆڕانە بێت.

زۆر پسـپۆڕ پێیـان وایە دەتـوانین هەمـوو شـتێک بپێـوین، هەنـدێکی تـر دەڵـێن مەحـاڵە بتـوانین هەمـوو شـتێک بپێـوین، بـۆ نمـوونە کـۆمەڵگەی مەدەنـی. وەک رێسـایەکی گشـتیی، پێویسـتە کـار بکەیـن بۆ دۆزینـەوەی ئامـانجی چۆنـایەتی کە بتوانرێـت مەزەنـدە بکرێـت و حـوکمی لەسـەر بـدرێت. لە کـاتی جێبەجێکردنـدا لە بیـرت بێـت شـێوازی گونجـاو بـۆ بەدیهێنـانی ئامانجەکـان بگـرێتە بەر، ئامـانجی دروسـت بـۆ بەدیهێنـانی پەیـام و ئەرکەکەت. پێویسـتە رێکخراوەکـان ناوبەنـاو پێـداچوونەوەی دیدگەکەیان بکەن و کار و پلانەکانیان هەڵبسەنگێنن.

## ئامانجی دارایی، الغايات المالية Financial Aims

**هەر هەنگاوێـک ئـگەر سـەرچاوەی پێویسـتی لەگەڵ نەبێـت بـۆ جێبەجێکردنی، ئەوا تەنێ خەونێکە.**

**پێویسە پلانە داراییەکە ئەم خاڵانە لەخۆبگرێت:**

- بودجەیەکی تێروتەسەل بۆ تێچووی پلانەکەت
- سـتراتیجێک بـۆ چـۆنیەتی دابینکردنـی تەمـویلی پێویسـت بـۆ جێبەجێکردنی پلانەکە.

**له کتێبی " توجیه وإدارة المؤسسات الخيرية " ئەندرۆ هیندAndrew Hind باسی ئەم هەنگاوانە دەکات بۆ دارشتنی پلانی تەمویل و چاودێری:**

- دەستنیشانکردنی گۆڕآوە دارایـیە بنەڕەتییەکانی چالاکییە خێرەومەندەکان.
- شیکردنەوەی حەساسیەتی ئەم گۆڕاوانە.
- هەڵسەنگاندنی تێچووی چالاکییەکانی پرۆژەکە لەناو پلانەکە و ژێرخانی کارگێڕیی و بەڕێوەبەرایەتی پێویست بۆ پشتگیریی لەم چالاکییانە.
- دەستنیشانکردنی ئامانج لە کۆکردنەوەی پارە بۆ سەرجەم دەستپێشخەرییە جۆراوجۆرەکانی رێکخراوەکە، و بەم شێوەیەش دەستنیشانکردنی کۆی داهات و خەرجییەکانی هەر دەستپێشخەرییەک.
- تاقیکردنەوەی بەردەوامیی ئەم ئامانجانە لە رێی بەراوردکرنیان لەگەڵ ئەدای پرۆسەی پێشوو بۆ کۆکردنەوەی پارە و دراوەکای تری بەردەست لە کەرتی خێرەومەندی.
- کۆکردنەوەی بودجەی ساڵی یەکەم و ئامادەکردنی پلانی دارایی بۆ ساڵانی داهاتوو لە پلانی ستراتیجییدا.
- دانانی رێوشوێنی کارا بۆ ڕاپۆرتی دارایی جەخت دەخاتە سەر ئەوەی کارگێڕی بە وردیی چاودێری پلانی دارایی بکات، و ئەندامانی لیژنەی ئەمینەکان ڕاپۆرتی تێروتەسەلیان پێ بگات

لەسەر پارە دراوەکان بە شێوەیەک لەبەردەستیان بێت کاتێک پێویست بکات ڕاستکردنەوەیان تێدا ئەنجام بدەن.

- کارکردن لەسەر هەندێک پارەی دراو ئاسانە (وەک کرێی بینایە و تێچووی گەشت) بەڵام هەندێکی تریان بەرچاو نیین و هەندێک جار فەرامۆش دەکرێن. نابێت تێچووی دەستپێکردنی کارێک لەبیر بکەین (واتە، بۆ نموونە، دامەزراندن و مەشقکردن بە ڕێکخەری مەشق)، و تێچووی لێشاوی نەختینە (واتە تێچووی گواستنەوەی پارە، تێچووی ئەو پارانەی درەنگ تەمویلەکەیان دەگات، تاد)، تێچووی چاککردنەوە و گۆڕین (بۆ نموونە گۆڕینی ئامێری فۆتۆکۆپی).
- تێچووی ئەو بابەتانەی چاوەڕوان نەدەکران (نەخۆشکەوتنی یەکێک لە هاوکارەکان، گرێبەست لەگەڵ پسپۆڕێکی یاسایی یا پسپۆڕێکی ژمێریاری،هتد).

# چاپتەری سێیەم

## فۆرمی پلانی ستراتیجی

نموونەیەکە بۆ ڕێنمایی

پاشکۆی هێڵە گشتییەکانی پلانی ستراتیجی

لاپەڕەی کار

**پێشەکی:**

ئامـــانجی ئەم لاپەڕەیە بـــریتییە لە دانـــانی نەخشـــەریگەیەک بـــۆ جێبەجێکردنی پلانی ستراتیجیی ڕێکخراوەکە لە کاتێکی دیاریکراودا بە گوێرەی بڕیاری بالای ڕێکخراوەکە (ئەنجومەنی متمانەداران، دەستەی کارگێڕی، هتد) و بە پشتبەستن بە خەڵکی پسپۆڕ و شارەزای ناو و دەرەوەی ڕێکخراوەکە.

**قۆناغەکانی دارشتنی پلان:**

قۆناغی یەکەم/ دیاریکردنی پەیکەر (هیکل)ی پلانی ستراتیجی (ستایڵ).

**قۆناغی دووەم/ قۆناغی کۆکردنەوە و شیکردنەوەی زانیاری:**

1. ئامادەکردنی پوختەی ڕاپۆرتی گشتیی، کە لە کۆنگرەی دەستەی گشتییدا راستێندراوە، بۆ ئەوەی ببێت بە بناغە بۆ پلانەکە بە سوود وەرگرتن لە پلانی ستراتیجی پێشووی ڕێکخراوەکە.

**2. ئامادەکردن و بڵاوکردنەوەی فۆرمی کۆکردنەوەی زانیاری بەسەر نوسینگەکانی رێکخراوەکە و بەشەکانی لە پارێزگاکان، کە ئەم پرسیارانە لەخۆدەگرێت:**

- خاڵەکانی بەهێزی و لاوازی رێکخراوەکەت کامەیە لە کارکردنی لە پارێزگاکەدا (پسپۆڕیی پێشوو، تایبەتمەندی، سەرچاوەی دارایی و مرۆیی).
- ئاستەنگەکان و دەرفەتەکان کامانەن لە پێش رێکخراوەکە بە گوێرەی ستراتیجی نوێ (هاوکاری لەگەڵ دەسەلاتی خۆجێی، رێکخراوە هاوبەشەکان، یاساکان).
- کۆکردنەوەی زانیاری و ئامار لەسەر پارێزگاکە لە بواری (ژمارەی دانیشتوان، ژمارەی قوتابخانەکان، ژمارەی منداڵ کە قوتابخانەیان بەجێهێشتووە، ژمارەی حاڵەتەکانی توندوتیژی دژی ژنان، ژمارەی رێکخراوە ناوخۆییەکان کە لەم بوارەدا کار دەکەن، ژمارەی رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان کە لەم پارێزگایە کار دەکەن، پلانی پارێزگە بۆ سێ ساڵی داهاتوو، دوایین لێکۆڵینەوەکان، ئەو بوارانەی دەکرێت کاریان تێدا بکرێت لە پارێزگاکە).
- پێشنیارکردنی ئەو بوارانەی کە دەکرێت لە پارێزگاکە کاری لەسەر بکەیــن لە بــواری ســتراتیجی پارێزگــاریی منــداڵ و خێــزان (پارێزگــاریی یاســایی، تەندروســتی، پەروەردە و خوێنــدن، بازرگانیکردن بە مرۆڤەوە، دروستکردنی داهات، توندوتیژی دژی منداڵان، ئاسایشی خێزان، چاکترکردنی رەوشی ئابووری خێزان،

کـــارکردنی منـــدالان، منـــدالانی ســـەر جادەکـــان، دادوەریـــی بـــۆ نەوجەوانان، قەیرەیی، بێوەژن، هتد) و بۆچی.

- میکانیزمەکـــانی کـــارکردن (هۆشـــمەندیی، راهێنـــانەوە، مەشـــق، لێکۆڵینەوە و توێژینەوە، داکۆکی، بەشداریکردن).
- ســـەرچاوە مرۆییەکـــانی بەردەســـت بە گـــوێرەی تایبەتمەنـــدی بـــۆ جێبەجێکردنـــی بەرنـــامە و پلانەکـــانی رێکخـــراوەکە (خـــۆبەخش، کرێکار، هاوبەش).
- ئەو لایەنـــانەی بەشـــدار دەبـــن لە پشـــتگیری بەرنـــامە و پلانەکـــانی رێکخراوەکە (مادی و مەعنەوی).

### 3. پێکهێنانی تیمێک بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لە بارەگای رێکخراوەکە بۆ جێبەجێکردنی ئەم چالاکییانە:

- سەردانی وەزارەتە پەیوەندارەکان بۆ کۆکردنەوەی زانیاری و ئاماری سوودبەخش بۆ پلانە ستراتیجییەکە.
- داواکاریی فەرمی لە وەزارەتی پلاندانان و فەرمانگەی ئامار بۆ ئەوەی ئامار و زانیاریمان بداتێ.
- رێکخســـتنی ســـەردان بـــۆ بارەگـــای ئاژانســـەکانی نەتەوە یەکگرتووەکـــان لە هەولێـــر بـــۆ بەدەســـتهێنانی پلانەکانیـــان بـــۆ ماوەی داهاتوو.
- پەیوەندیکردن بە هاوبەش و لایەنە کۆمەککارەکانەوە بۆ ئەوەی ستراتیجی خۆیانمان بدەنێ بۆ چەند ساڵی داهاتوو.

- پێداچوونەوەی ڕاپۆرتی پرۆژە جێبەجێکراوەکان لە ساڵانی ڕابردوو، و ئامادەکردنی لاپەڕەیەک بە زانیاری سوودبەخش بۆ پلانی ستراتیجی.

**4. پێکهێنانی تیمی شیکردنەوەی زانیاری، بۆ:**

- داخڵکردنی فۆرمی زانیارییەکان لە کۆمپیوتەر.
- شیکردنەوەی ئامار و زانیاری و خشتەکان، و دارشتنی ڕەشنووسی یەکەم.

**قۆناغی سێیەم/ قۆناغی نووسینی پلانی ستراتیجی (وەک لەسەری ڕێککەوتوون)**

ڕێکخراوی ......................

پرۆژەی ئامادەکردنی پلانی ستراتیجی بۆ ڕێکخراوەکە

**فۆرمی کۆکردنەوەی زانیاری**

**پێشەکی:**

کۆمەڵگەی مەدەنی لە سەرەتای دروستبوونییەوە تا ئەمڕۆ لە کێشمەکێشی بەردەوامدایە، و کۆمەڵگەی مرۆڤ وەک سروشتێکی ئاسایی خۆی پێویستی بە ڕێکخستنەوەی یەکە کۆمەڵایەتییەکانی هەیە بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی باشتر و دادپەروەرانەتر بتوانێت تەعبیر لە داواکارییەکانی چین و توێژەکان بکات، هەروەها بۆ ئەوەی

ببێت بە بنکەیەک بۆ هاوکاری و هەرەوەزی و پشتبەستنی کەمتر بە دەستگا حکومییەکان بۆ پێشکەشکردنی خزمەتگوزاریی، هەروەها، بۆ کەمکــردنەوەی پێشــێلکارییەکان چــونکە ئەوانە دەســتگایەکن بــۆ چــاودێری ئەدا و کــارایی حکــومەت بە مەبەســتی بەدیهێنــانی مافەکانیــان. هەر بــۆیە بەشــێکی گرنــگ لە دەســتگاکانی کــۆمەڵگەی مەدەنــی بە گــوێرەی قۆنــاغە مێژوویەکــان ســەریان هەڵــداوە. ئەمــڕۆ ئەرکی دەستگاکانی کۆمەڵگەی مەدەنی بریتین لە:

- ببێت بە پردی پەیوەندی لە نێوان هاووڵاتی و دەسەڵات.
- هێزی فشار بێت بۆ جێبەجێکردنی داواکارییەکانی خەڵک.

**لەو وڵاتانەی تازە ئاشنا دەبن بە دیموکراسی، ئەرکی رێکخراوە ناحکومییەکان جیاوازە لە هی کۆمەڵگەکانی تر، گرنگترینیان بریتین لە:**

- بەشداریی لە پرۆسەی هۆشمەندیی.
- بەشــداریی لە پێشکەشــکردنی خزمەتگوزارییەکــان شانبەشــانی دەســتگا حکومییەکــان و جێبەجێکردنــی بە گــوێرەی ئامانجەکــانی رێکخراوەکە.

بە گــوێرەی ئەو باکگراوەنــدەی پێشــوو کــار دەکــات و خــۆی بە هاوبەشی سەرجەم ئەو دەستگایانە دادەنێت کە کار بۆ چاکترکردنی رەوشــی ژیــانی مــرۆڤ دەکەن، و وەک دەســتگایەکی نــاحکومیی سەربەخۆ لە ژینگەی کار و کۆمەڵگەکەیدا کار دەکات بۆ:

1- ڕاگەیاندنی کارەکانی بە نووسین لە ڕێی (ئێمە کێین، و بەهاکانمان کامانەیە و چۆن خزمەتگوزاری پێشکەش دەکەین و چۆن بەرنامەکانمان جێبەجێ دەکەین).
2- پشتبەستن بە سیستمی دامەزراوەیی.
3- پشتبەستن بە زانیاری و ئامار و پلاندانان بۆ جێبەجێکردنی بەرنامەکانی ڕێکخراوەکە.
4- هاوکاریی ئەو کەسانەی زۆر نەدارن بە گوێرەی ستراتیجی پارێزگاریی خێزان و منداڵان.
5- مەشقکردن و دابینکردنی پێویستییەکانی کار بۆ کارمەندان لە ژینگەی کاردا.
6- سوودوەرگرتن لە تایبەتمەندی و ئەزموون و تەکنەلۆجیای نوێ.
7- بەدواداچوون و چاودێری و هەڵسەنگاندن و فیدباک (التغذیة الاسترجاعیة)
8- بەشدارییپێکردن و تۆڕبەندی (التشبیک، Networking) و داکۆکی (المدافعة، Advocacy).
9- ڕێزگرتن لە یاسا کارپێکراوەکانی ژینگەی کار.

ڕێکخراوەکە کار دەکات بۆ پتەوکردنی ڕێچکەی وەک لە ستراتیجەکەیدا هاتووە و بۆ ئەوەی تایبەتمەند بێت لە بوارەکەیدا بە گوێرەی ئەو کارانەی پێشکەشی کردووە لە خولەکانی پێشتر، و بەرەو چەسپاندن و گەشەپێدانی پرەنسیپ و بەهاکانی.

## ئەم فۆرمە:

دوای بڕیاردان لەسەر ستراتیجەکانی ڕێکخراوەکە لە کۆنگرەی دەستەی گشتیی یان کۆبوونەوەی بەرفراوانی ....، دەستەی کارگێڕی کار دەکات بۆ ئامادەکردنی پلانـی سـتراتیجی بـۆ سـێ سـاڵی داهـاتوو بە پشتبەسـتن بە کەسـانی پسـپۆڕی بـوارەکە. ئامـانجی فـۆرمەکە بـریتییە لە کـۆکردنەوەی زانیـاری پێویسـت بـۆ دەسـتکردن بە پرۆسـەی نووسـینی پـلان، بە پشتبەسـتن بە دیـدگە و پەیـامی ڕێکخراوکە کە بریتین لە:

**دیدگە: جیهانێک کە مرۆڤەکان تێیدا هەموو مافەکانیان بە تەواوەتی هەبێت.**

پەیام (الرسالة، المهمة، Mission): ڕێکخراوێکی ناحکومیی سـەربەخۆی قازانج-نەویست بۆ بەرژەوەندیی گشتیی کار دەکات، بە گوێرەی بەها مرۆییەکانی، و لە پێنـاو چـاکترکردنی ژیـان، و چەسـپاندنی پرەنسـیپەکانی مافەکـانی مـرۆڤ، و بنیاتنـانی کـۆمەڵگەی مەدەنـی و گەشەسـەندوو، ئەمەش لە ڕێـی جێبەجێکردنـی بەرنـامە و پـرۆژەی گەشەسـەندن بە تـایبەتی لە بـواری پارێزگـاریی خێـزان و منداڵان.

**تکایە هاوکاریمان بکەن بۆ پڕکردنەوەی ئەم فۆرمە لە کاتی خۆیدا.**

- بەشی یەکەم/ زانیاریی گشتیی

| | |
|---|---|
| پارێزگا | |
| | |
| نووسینگە یان بەش | |
| | |
| ناوی بەڕێوەبەری نووسینگە یان بەش | |
| | |
| مێژووی پڕکردنەوەی فۆرمەکە | |

## بەشی دووەم/ خاڵەکانی بەهێزی و لاوازی، دەرفەتەکان و ئاستەنگەکان

| خاڵەکانی بەهێزیی ڕێکخراوەکەتان کامانەیە لە پارێزگاکەتان (بۆ نموونە پسپۆڕیی پێشوو، تایبەتمەندی، سەرچاوەی دارایی و مرۆیی)؟ | |
|---|---|
| | |
| خاڵەکانی لاوازیی ریێکخراوەکەتان کامانەیە لە پارێزگاکەتان (بۆ نموونە نەبوونی پسپۆڕیی، لاوازیی سەرچاوە مرۆیی و داراییەکان)؟ | |
| | |
| ئەو ئاستەنگانە کامانەن کە دێنە ریێ کاری ریێکخراوەکەتان لە هەمبەر ستراتیجی نوێتان لە پارێزگاکە (وەک هاوکاریی دەسەڵاتی خۆجێی، ریێکخراوە هاوبەشەکان، یاساکان)؟ | |
| | |
| ئەو دەرفەتانە کامانەیە کە پێشبینی دەکەن برەخسێت بۆ ریێکخراوەکەتان لە پارێزگاکە بە گوێرەی ستراتیجە نوێیەکە؟ | |

## بەشی سێیەم/ زانیاریی گشتیی لەسەر پارێزگاکە

| ژمارەی دانیشتوان بە گوێرەی دوایین زانیاری | |
|---|---|
| | |
| ژمارەی قوتابخانەکان | |
| | |
| ژمارەی ئەو منداڵانەی خوێندنیان بەجێهێشتووە | |
| | |
| ژمارەی حاڵەتەکانی توندوتیژی دژی ژنان | |
| | |
| ژمارەی ئەو ریێکخراوە ناوخۆییانەی لەم بوارەدا کار دەکەن (پارێزگاریی لە خێزان و منداڵ) | |
| | |
| ژمارەی ئەو ریێکخراوە نێودەوڵەتییانەی لە پارێزگاکە کار دەکەن | |

| | |
|---|---|
| | |
| پلانی پارێزگاکە بۆ سێ ساڵی داهاتوو | |
| | |
| ئەو بوارانەی کە دەتوانین کاری تێدا بکەین لە پارێزگاکە | |
| | |
| دواترین لێکۆڵینەوەکان و توێژینەوەکان لە پارێزگاکە لەسەر پارێزگاریی لە خێزان و منداڵ | |
| | |
| زانیاری تر | |
| | |
| زانیاری تر | |
| | |
| زانیاری تر | |

- **بەشی چوارەم/ پێشنیارکردنی ئەو بوارانەی کە دەتوانرێت کاری لەسەر بکرێت لە پارێزگاکە لە دووتوێی ستراتیجی پارێزگاریکردن لە خێزان و منداڵ**

| بوار | بەڵێ، نەخێر | بۆچی |
|---|---|---|
| پارێزگاریی یاسایی | ☐بەڵێ<br>☐نەخێر | |
| | | |
| تەندروستی | ☐بەڵێ<br>☐نەخێر | |
| | | |
| پەروەردە و زانیاری | ☐بەڵێ<br>☐نەخێر | |
| | | |
| بازرگانیکردن بە مرۆڤەوە | ☐بەڵێ<br>☐نەخێر | |

| | | |
|---|---|---|
| توندوتیژی دژی منداڵان | ☐بەڵێ<br>☐نەخێر | |
| | | |
| ئاسایشی خێزان | ☐بەڵێ<br>☐نەخێر | |
| | | |
| چاکترکردنی رەوشی ئابووری خێزان | ☐بەڵێ<br>☐نەخێر | |
| | | |
| **کارکردنی منداڵان** | ☐بەڵێ<br>☐نەخێر | |
| | | |
| **منداڵی سەر شەقامەکان** | ☐بەڵێ<br>☐نەخێر | |
| | | |
| **دادپەروەریی بۆ نەوجەوانان** | ☐بەڵێ<br>☐نەخێر | |
| | | |
| **قەیرەیی** | ☐بەڵێ<br>☐نەخێر | |
| | | |
| **توندوتیژی دژی ژنان** | ☐بەڵێ<br>☐نەخێر | |
| | | |
| **بێوەژنان** | ☐بەڵێ<br>☐نەخێر | |
| **بواری تر کە ناوی نەهاتووە** | | |

- **بەشی پێنجەم/ میکانیزمەکانی کارکردن**

| میکانیزم | بەڵێ یان نەخێر | بۆچی |
|---|---|---|
| هۆشمەندیی | ☐بەڵێ<br>☐نەخێر | |
| | | |
| ڕاهێنانەوە | ☐بەڵێ<br>☐نەخێر | |
| | | |
| مەشق | ☐بەڵێ<br>☐نەخێر | |
| | | |
| لێکۆڵینەوە و توێژینەوە | ☐بەڵێ<br>☐نەخێر | |
| | | |
| داکۆکی | ☐بەڵێ<br>☐نەخێر | |
| | | |
| بەشداریکردن | ☐بەڵێ<br>☐نەخێر | |
| | | |
| هی تر | ☐بەڵێ<br>☐نەخێر | |
| | | |

- **بەشی شەشەم/ سەرچاوەی مرۆیی بەردەست بە گوێرەی تایبەتمەندی بۆ جێبەجێکردنی بەرنامە و پلانەکانی رێکخراوەکە**

| | ژمارە و تایبەتمەندی |
|---|---|
| خۆبەخش | |
| | |
| کرێکار، بە کرێ | |
| | |
| هـــــاوبەش (ڕێکخــــــراوە هاوبەشەکان) | |
| | |
| هی تر | |

| بەشـــی حەوتەم: ئەو لایەنــانە کامــانەن کە دەتــوانن پشــتگیری بەرنــامە و پرۆژەکانی رێکخراوەکەت بکەن لە پارێزگاکەت (مادی و مەعنەوی) |
|---|
| |

| بەشی هەشتەم: زانیاریی تر |
|---|
| |

# پلانی ستراتیجی بۆ سێ ساڵ 2011 -2013

**ڕێکخراوی ..................**

ڕێکخراوی ........................ وەک ڕێکخراوێکی ناحکومی کە سیستمی دامەزراوەیی پیادە دەکات بەردەوام هەموو سێ ساڵ جارێک بە گوێرەی پەیڕەوی ناوخۆ، کۆنگرەی دەستەی گشتیی بەستووە، یەکێک لە گرنگترین ئەنجامەکانی کۆنگرەی دەستەی گشتیی بریتییە لە هەڵسەنگاندنی کاری خولی پێشوو، و دیاریکردنی ستراتیج بۆ خولی داهاتوو، و هەڵبژاردنی ئەنجومەنی متمانەداران، کە ئەرکەکەیان بریتییە لە ئامادەکردنی پلانی ستراتیجی بۆ سێ ساڵ.
کۆنگرەی دوایینی دەستەی گشتیی ڕێکخراوەکە، کە لە 2010/6/27 کۆتایی هات، بڕیاری دا بە پیادەکردنی پرەنسیپی تایبەتمەندی لە چالاکییەکانی ڕێکخراوەکەدا، و "پارێزگاریی لە خێزان و منداڵ" کرا بە ناونیشانی سەرەکی بۆ کاری ڕێکخراوەکە لە ماوەی قۆناغی داهاتوودا.

## ئامادەکردنی پلانی ستراتیجی ڕێکخراوەکە پشتی بەستبوو بە:

1. بەڵگەنامەی کۆتایی کۆنگرەی دەستەی گشتیی ڕێکخراوەکە لە حوزەیرانی ٢٠١٠، بە تایبەتی ڕاپۆرتی گشتیی.
2. شیکردنەوەی فۆرمی زانیاری و هەڵسەنگاندن کە نووسینگەکانی ڕێکخراوەکە و ڕێکخراوە هاوبەشەکان ئامادەیان کردبوو و دابەشیان کردبوو.

3. فۆرمی پلانی ستراتیجی چەند ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی.
4. ئەنجامی کۆبوونەوەی ئەو لیژنانەی بە ئامادەکردنی پلانەکە ڕاسپێردابوون.

## ئەم پلانە هەوڵ دەدات وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بداتەوە

- ئێمە کێین؟
- تواناکانی بەردەستمان کامانەیە، دەتوانین چی بکەین؟
- کام گیروگرفت چارەسەر دەکەین؟
- ئەو جیاوازییە چییە کە ئێمە دەمانەوێت دروستی بکەین؟
- کام بابەتی یەکلاکەرەوە پێویستە وەڵامی بدەینەوە؟
- پێویستە لە کوێ سەرچاوەکانمان تەرخان بکەین؟ پێویستە ئەولەوییاتەکانمان کامانە بێت؟
- پێویستە ئامانجی ڕاستەوخۆمان چی بێت؟
- چۆن خۆمان ڕێک بخەین بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە؟
- کێ چی دەکات، چۆن و کەی؟

## پلانەکە بۆ ئەم بەشانە دابەش دەبێت:

بەشی یەکەم: هێڵە گشتییەکانی ستراریجی ڕێکخراوەکە

بەشی دووەم: ناسنامەی ڕێکخراوەکە.

بەشی سێیەم: شیکردنەوەی چوارینە بۆ ڕێکخراوەکەSWOT.

بەشی چوارەم: پارێزگاریی لە خێزان و منداڵ.

بەشی پێنجەم: جێبەجێکردنی پلانەکە، دابینکردنی سەرچاوەکان، بەدواداچوون، هەڵسەنگاندن

# هێڵە گشتییەکانی ستراتیجی ...................

## پێشەکی :

کاتێک ...................... دەست دەکات بە دانانی پلانی ستراتیجی، پێویستە ڕەوشی عێراق بە گشتیی ڕەچاو بکات، عێراق لە ڕەوشێکی شلۆقدایە، و ئەمەش کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر کاری ڕێکخراوە ناحکومییەکان و ژیانی هاوولاتیان. لەم سالانەی دواییدا دەستگا فەرمییەکانی عێراق هەولّی دا ئاسەواری دکتاتۆرییەت بسڕێتەوە و دەولّەتێکی نوێ بنیات بنێت لەسەر بناغەی ڕێزگرتن لە یاسا و کارکردن بە پرەنسیپەکانی دیموکراسی و ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ. لە بواری کردارییەوە و بەم ئاراستەیە، هەلّبژاردن ئەنجام درا بۆ ئەوەی ڕەوایەتی بدرێت بە دامەزراوەکانی دەولّەت. ئەم ڕێوشوێن و هەولانە وەک زۆر کاروباری تر، خالّی ئەرێنی و نەرێنی هەبوو. گرنگترین شت ئەوەیە کە هاوولاتیان کار بۆ ئاییندەیەکی باشتر دەکەن بە شێوەیەک کە هیواکانیان بهێنێتە دی.

لەگەلّ ئەمەشدا، ڕاپۆرتەکانی ئاژانسەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ڕەوشی عێراق بەرەو خراپتر دەچێت، بە تایبەتی لە بواری ئاسایش و خزمەتگوزارییدا، کە ڕەوشێکە هەڕەشەیە لەسەر مرۆڤەکان.

لە عێراق، بێجگە لە هەرێمی کوردستان، هاوولاتی ناتوانێت ژیانی ڕۆژانەی خۆی بژی، لەبەر سەختیی ڕەوشی ئاسایش، ڕۆژانە دەیان کەس دەبن بە قوربانیی، لە هەندێک ناوچە ژیان بە تەواوەتی ڕاوەستاوە. ئەم حالّەتە لەسەر ڕەوشی ئابووری خێزانەکان ڕەنگی

داوەتەوە. وەک ئامارەکـان ئامـاژەی پێـدەکەن ژمـارەی ئەو کەسـانە بەردەوام زیـاد دەکـات کە لە ژێـر هێڵـی هەژاری دەژیـن، ئەگەرچـی حکومەت مووچەی کارمەندانی زیاد کردووە. هەروەها، ئاوارەبوونی نـاوخۆ هەیە لە ئەنجـامی زەبروزەنـگ بە تـایبەتی لە دژی کەمینەکـانی عێـراق. ڕاپۆرتەکـانی نەتەوە یەکگرتووەکـان باسـی ئەوە دەکەن کە نزیکەی دوو ملیۆن هاوولاتی لەناوخۆ و دەرەوەی عێراق ئاوارە بوون و ژیانیـان لە مەترسـیدایە. نەبـوونی ڕەوشـی گونجـاوی تەندروسـتی و ئابووری کاری کردووە لەسەر ڕەوشی خێزان بە تایبەتی لەسەر توێژە بێبەشـەکانی کـۆمەڵگە وەک منـداڵ و ئافرەتـان. بە تـایبەتی تـۆوی تونـدوتیژی خێزانـی و کـۆمەڵگەیی سـەر هەڵـدەدات و ئامـاژەیەکی مەترسیدارە. بۆیە پێویستە کار بکەین بۆ بلاوکردنەوەی بیرۆکەی نوێ و کارکردن لە بواری گەڕاندنەوەی سەقامگیری بۆ خێزان. بە شێوەیەک کە بوار بکرێتەوە بۆ تاکەکەسەکان بە تایبەتی هەژاران و ئاوارەکان کە زۆرترین زیانیـان پێگەیشتووە، بە مەبەسـتی چەسپاندنی سـەقامگیریی کـۆمەڵایەتی. بەم شـێوەیە متمانەیـان بە خۆیـان بـۆ دەگەڕێـتەوە بـۆ کارکردن لەناو کۆمەڵگە و تێکەڵاوبوونەوەی کۆمەڵگە و دەرچوونیان لە گۆشـەگیری. ئەم کـارە تەنیـا بە حکـومەت ناکرێـت بەڵکـو پێویسـتە ڕێکخراوەکـانی کـۆمەڵگەی مەدەنـی کـار بـکەن بـۆ گەرەنتیـی ژیـانێکی باشتر بۆ تاکەکان و خێزانەکان.

بۆیە پێویستە یەکەمین ئەرکەکانی ڕێکخراوی ........... لە ئایندەدا بریتی بێت لە جەختکردنەوە لە پرەنسیپەکانی مافی مرۆڤ وەک ڕێنماییەکی بنچینەیی کاتێک پلانی ستراتیجی دادەنێت بۆ سێ ساڵی داهاتوو، و لەسـەر ئەم بنـاغەیە پلانـی سـاڵانە دابڕێژێـت. پێویسـتە هەنـدێک لە

بڕگەکانی لە لیستی پرەنسیپەکان دابنرێت بە تایبەتی مافەکانی مەدەنی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری. پێویستە ئەم کارە بە هاوبەشی بکرێت بۆ پتەوکردنی توانای کارمەندانی بواری کۆمەڵگەی مەدەنی و گەشەسەندنی بەردەوام.

رەوشـــی هەنـــووکەیی لە هەرێمـــی کوردســـتان وا دەخوازێـــت لە رێکخراوەکە کە ستراتیجی ئەوتۆ دابنێت کە گونجاو بێت لەگەڵ رەوشی کوردستان لە بواری ئاسایش و گەشەی ئابووری، بە تایبەتی لە بواری بنیاتنـــانی هەرێمێکـــی دیمـــوکرات. ئەو گۆڕانکـــارییە کۆمەڵایەتییـــانەی ناوچەکە بە خۆیەوە دەبینێت، بە پێچەوانەی ناوچەکانی تری عێراقەوە، شـایانی سـەرنجە و بۆیە پێویستە جەخت بخەینە سەر ئەو بابەتانەی دەتوانین لە هەرێم کاری لەسەر بکەین بە تایبەتیش بابەتەکانی وەک پێشـێلکردنی مـافی مـرۆڤ، گەشـەپێدانی گیـانی هـاوولاتیتی، بێکـاری، گەندەڵیی ئیداری، دەستور و یاسا، خراپیی سیستمەکانی پەروەردە و فێرکــردن، پێشکەشــکردنی خزمەتگوزارییەکــانی وەک تەندروســتی و کارەبا و هتد.

ئەم قۆنـاغە پێویسـتی بە کـارکردنە بـۆ گەشـەی بەردەوام لە هەرێمـی کوردستان، بۆ ئەم مەبەستە پێویستە دەست بکەین بە کۆکردنەوەی زانیاری بەرایی ورد لەسەر کاریگەری گۆڕانکارییەکانی بواری کار و کـارگێڕی و گەشـــەی شارســـتانی کە هەرێـــم بە خـــۆیەوە دەیبینێـــت. پێویستە ئەم کـارانە شانبەشـانی ئەو گۆڕانکارییـانە ئەنجـام بـدرێت کە روودەدەن لە بوارەکانی کۆمەڵایەتی و شێوەی ژیان. ئەمەش لە رێی لێکـــۆڵینەوەی زانســـتی و کـــاری هەرەوەزی و مەشـــق و فشـــار و رۆشنبیرکردن.

سـەبارەت بەشـەکانی تـری وڵاتەکە، ناوەڕاسـت و خـوارووی عێـراق، پێویستە ستراتیجی جیاواز ئامادە بکرێت و چالاکییەکان بگونجێن لەگەڵ رەوشی ئەو ناوچانە، پێویستە پرۆژەی ناکاوی لەخۆ بگرێت بە تـایبەتی بـۆ ناوەڕاسـت. لەوێ مەترسـیی هەیە لە ڕوودانـی تراجیـدیای مرۆیـی، وەک سـەرنج دەدرێـت دەیـان حـاڵەتی پێشـێلکردنی مـافی مـرۆڤ ڕوودەدات رۆژانە، بە تایبەتی دژی هاووڵاتیانی بێتاوان. هەر بۆیە لەم قۆنـاغەدا پێویسـتە کـار بکەیـن لەسـەر بـواری ئسایشـی مـرۆڤ و ئاشـتەوایی نیشـتمانی و پێکەوەژیـانی ئاشـتییانە و چارەسـەرکردنی ناکۆکییەکان و یەکتری قبوڵکردن و بنیاتنانی دەوڵەیت یاسا. ئەمەش بە بەشـداریی هەمـووان چـونکە دەربـڕی هیـوا و ئـاواتی هەمـوو گەلە بە هەمـوو چـین و توێژەکـانییەوە بـۆ ئەوەی بەردی بنـاغە دابنێـین بـۆ عێراقێکی نوێ دوور لە مەزهەبگەرایی کە پێچەوانەی هەمـوو پێوەرێکی نیشتمانییە.

هەر بۆیە دەتـوانین بلێین هەنـدێک فـاکتەری هـاوبەش و هەنـدێکی تـری جیـاواز هەیە لە نێـوان هەرێمـی کوردسـتان و بەشـەکانی تـری عێـراق، بەڵام بە گـوێرەی ڕاپـۆرتە نێودەوڵەتییەکـان و ناوخۆییەکـان و تەنـانەت فەرمییەکـان، منـداڵان ئەو تـوێژەن کە زۆرتـرین پێشـێلکاری دژیـان دەکرێـت، پێشـێلی مـافە سـەرەتاییەکانی منـداڵ کە عیـراق بە خۆیشـی واژووی لەسـەر رێککەوتـنە نێودەوڵەتییەکـانی کـردووە. تـا ئێسـتاش خێزانـی عێراقـی بە دەسـت نەبـوونی سـادەترین کۆڵەکەکـانی بنیاتنـانی خێزانەوە دەناڵێنێت، بۆیە، پێویسـتە کـار بکەیـن بـۆ پتەوکردنـی توانـای رێکخـراوە ناحکومییەکـانی بـواری چـاودێریی مافەکـانی مـرۆڤ و ئەو چـاودێری ئەو پێشـێلکارییانەی روودەدەن، ئەمەش بە هاوکـاری لەگەڵ

میـــدیا و ڕێکخـــراوه نێودەوڵەتییەکـــان و ئاژانســـەکانی نەتەوه یەکگرتووەکـان به مەبەسـتی چـاکترکردنی ژیـان و پارێزگـاریکردن له خێزان و منداڵانی عێراق، که ژیانیان له مەترسیدایه.

هەر بۆیه ڕێکخراوەکەمان دروشمەکەی (مرۆڤ، گەشەسـەندن، ئایینده) گواستەوه بۆ قۆناغێکی نویَ له ڕێـی پێشکەشکردنی خزمەتگوزاریی به گـوێرەی پلانـی سـتراتیجی سـاڵانی ٢٠١١-٢٠١٢-٢٠١٣ و له ئەنجـامی گەشەسـەندنی پەیوەنـدییەکانی ڕێکخـراوەکه لەگەڵ هاوبەشـەکانی لەو سـاڵانەدا. ڕێکخـراوی .....خـۆی به هاوبەشـی سـەرجەم ڕێکخـراوه سەربەخۆ ناحکومییەکان دەزانێت بـۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی هەزارەی نویَ، ئەمەش به شێوازی زانستی بۆ مەزەندەکردنی پێویستییەکانی ئەو تـوێژانەی ڕووبەڕووی زەحمەتـی دەبـنەوه و زۆر زوڵمیـان لـیَ کـراوه، هەروەهـا له ڕێـی دانـانی پـلان و بەرنـامەی کـار و جێبەجێکردنـی لەگەڵ بەدواداچوون و هەڵسەنگاندنی ئەم بەرنامانه. ئەم کارانەش تەبان لەگەڵ توانا مرۆیی و داراییەکان و پسپۆڕیی ڕێکخراوەکه و ژینگەی کارەکەی. لەبەر بڕوامان بەو خاڵانەی له بەڵگەنامەی جاڕی جیهـانیی مـافی مـرۆڤ و بەڵگەنامەکـانی تـری بـواری مـافی مرۆڤـدا هـاتووه، ڕێکخراوەکەمـان، ڕێکخـراوی فریـاکەوتنی میللـی، چەنـد سـتراتیجێکی کـردووه به بنـاغەی کارەکانی، ناونیشانه سەرەکییەکەی بریتییه له:

**کارکردن بۆ بەدیهێنانی ئەو بابەتانەی له پەیماننامه و ڕێککەوتننامەکانی بواری مافی مرۆڤدا هاتووه، بۆ دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی سەقامگیر و ژیـانی به کەرامەت، لەم پێنـاوەدا ڕێکخراوەکەمـان دامەزراوه و سـتراتیج و پـلان و بەرنـامەی داڕشـتووه بـۆ ئەنجامـدانی چـالاکیی جۆراوجۆر به شێوازی ئاشتیخوازانه.**

**ڕێکخراوەکە خاوەنی ناسنامەی خۆیەتی، کە جیای دەکاتەوە لە ڕێکخراوەکانی تر و وەک دەستور وایە بۆ ڕێکخراوەکە، کە لێرەدا بەرجەستە دەبێت:**

پەیام: ڕێکخراوی ......... ڕێکخراوێکی سەربەخۆی ناحکومیی قازانج-نەویستە بە گوێرەی بەها مرۆییەکانی کار دەکات بۆ چاکترکردنی ژیان و چەسپاندنی پرەنسیپەکانی مافی مرۆڤ و بنیاتنانی کۆمەڵگەی مەدەنیی گەشەسەندوو، لە ڕێی جێبەجێکردنی بەرنامە و پرۆژەی گەشەسەندن بە تایبەتی لە بواری پارێزگاریکردن لە خێزان و منداڵ.

**دیدگە: جیهانێک کە مرۆڤەکان تێیدا هەموو مافەکانیان بە تەواوەتی هەبێت.**

**پرەنسیپ و بەهاکان:**

- پابەندێتی بە پەیماننامە و ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکانی بواری مرۆڤ و مافەکانی.
- پابەندێتی بە دیموکراتییەوە.
- کاری خۆبەخشانە و بەرژەوەندیی گشتیی.
- بێلایەنی، شەفافییەت، سەربەخۆیی، ڕاستگۆیی، لێبوردەیی، و نەبوونی جیاکاری.
- هاوکاری، هاوبەشی، هەرەوەزی، یەکسانیی دەرفەت، هاوسەنگیی جێندەر، پەیداکردنی متمانەی سوودمەندان، پیشەیی، بەرپرسیارێتی.
- پارێزگاریکردن لە نهێنیی شەخسیی.

**بۆ کارکردن بەو پرەنسیپانە ڕێکخراوەکە لە ستراتیجەکەیدا جەخت دەخاتە سەر:**

1- ڕاگەیانـدنی کارەکـانی بە نووسـین لە ڕێـی (ئـێمە کێـین، و بەهاکانمان کامانەیە و چۆن خزمەتگوزاری پێشکەش دەکەین و چۆن بەرنامەکانمان جێبەجێ دەکەین).

2- پشتبەستن بە سیستمی دامەزراوەیی.

3- پشتبەسـتن بە زانیـاری و ئامـار و پلانـدانان بـۆ جێبەجێکردنـی بەرنامەکانی ڕێکخراوەکە.

4- هاوکـاریی ئەو کەسـانەی زۆر نەدارن بە گـوێرەی سـتراتیجی پارێزگاریی خێزان و منداڵان.

5- مەشـقکردن و دابینکردنـی پێویسـتییەکانی کـار بـۆ کارمەنـدان لە ژینگەی کاردا.

6- سـوودوەرگرتن لە تایبەتمەنـدی و ئەزمـوون و تەکنەلۆجیـای نوێ.

7- بەدواداچـوون و چـاودێری و هەڵسـەنگاندن و فیـدباک (التغذیـة الاسترجاعیة)

8- بەشـداریپێکردن و تۆڕبەنـدی (التشـبیک، Networking) و داکۆکی (المدافعة، Advocacy).

9- ڕێزگرتن لە یاسا کارپێکراوەکانی ژینگەی کار.

ڕێکخـراوەکە کـار دەکـات بـۆ پتەوکردنـی ڕێچـکەی وەک لە ستراتیجەکەیدا هاتووە و بۆ ئەوەی تایبەتمەند بێت لە بوارەکەیدا بە

گـوێرەی ئەو کـارانەی پێشکەشـی کـردووە لە خولەکـانی پێشـتر، و بەرەو چەسپاندن و گەشەپێدانی پرەنسیپ و بەهاکانی.

**ناسنامەی ڕێکخراوەکە**

ڕێکخراوی: ........................................

تایبەتمەندی: پارێزگاری لە خێزان و منداڵ

ناوچەکـانی کـار: سـەرجەم پارێزگاکـانی عێـراق، وپلانـدانان بـۆ گواستنەوەی چالاکییەکانی ڕێکخراوەکە بۆ وڵاتی تر لە قۆناغەکانی ئاییندەدا.

**توێژی بەئامانجگیراو (المستهدفة ):**

بە شێوەیەکی گشتیی خێزان و بە تایبەتیش منداڵ و ژن.

**دەستگاکانی ڕێکخراوەکە:**

**ڕێکخراوەکە سێ دەستگای سەرەکیی هەیە بە گوێرەی پەیڕەوی ناوخۆ:**

1. کـۆنگرەی دەسـتەی گشـتیی: ئەرکەکـانی بـریتییە لە رەسـمکردنی سیاسـەتی گشـتیی کـاری ڕێکخـراوەکە و هەڵبژاردنـی ئەنجـومەنی متمانەداران.
2. ئەنجـومەنی متمـانەداران (الأمنـاء، ڕازگـران): ئەرکەکەی چـاودێری و یاسادانانە و ئەم دەستەی کارگێڕی هەڵدەبژێرێت.
3. دەسـتەی کـارگێڕی (ئەنجـومەنی کـارگێڕی): بـاڵاترین دەسـتەی جێبەجێکـارە لە ڕێکخـراوەکەدا و بەرپرسـە لە جێبەجێکردنـی پلانـی ستراتیجی.

پەیکەری سەرەکیی:



## شیکردنەوەی چوارینەی سواتSWOT

## خاڵەکانی بەهێزی، لاوازی، دەرفەتەکان، و ئاستەنگەکان

### ژینگەی ناوخۆیی:

### خاڵەکانی بەهێزیی:

1. زۆریی پرۆژە و چالاکییە جێبەجێکراوەکان و بەردەوامییان لە ماوەی چەندین ساڵی ڕابردوو کە ئاماژەن بە سەرکەوتوویی ڕێکخراوەکە لە بەکارهێنانی سەرچاوە دارایی و مرۆییەکانیدا بۆ جێبەجێکردنی چالاکیی جۆربەجۆر و کەڵەکەبوونی پسپۆڕیی تێیدا.
کۆی پرۆژەکان (68) پرۆژە بە گوێرەی ئەم خشتەیە:-

| مافی مرۆڤ | دیموکراسی | پەروەردە و فێرکردن | دادپەروەریی ئینتقالی | تەندروستی و ژینگە | پێکەوەژیان و ئاشتی |
|---|---|---|---|---|---|
| 25 | 10 | 4 | 7 | 17 | 5 |

2. تەبایی پرۆژە جێبەجێکراوەکان لەگەڵ ئامانجەکانی ڕێکخراوەکە وەک لە پلانی ستراتیجیدا هاتووە.
3. هەبوونی کاریگەریی ئەرێنی ڕێکخراوەکە لەو ناوچانەی کاری لێ دەکات.
4. بنیاتنانی توانای کارمەندان، و هەبوونی پسپۆڕیی دەگمەن، و گەشەپێدانی چەندایەتی و چۆنایەتی خۆبەخشەکان، ئەم خشتەیەی خوارەوە بریتییە لە ژمارەی کۆرسەکان لە ناوەوە و دەرەوە:

| ساڵ | خول – ناوخۆ | خول – دەرەوەی کوردستان |
|---|---|---|
| 2007 | 45 | 18 |
| 2008 | 100 | 49 |
| 2009 | 59 | 23 |
| کۆی بەشداران | 204 | 90 |

5. ڕێکخراوەکە توانای هەبووە سەرچاوەی جۆراوجۆری تەمویل پەیدا بکات، وەک لە پرۆژە جۆراوجۆرەکانییەوە دیارە :

| UN and EU | INGOs | LNGOs | حکومەت، فەرمانگەی ڕێکخراوەکان | کەرتی تایبەت |
|---|---|---|---|---|
| %20 | %42 | %11 | %11 | %16 |

6. ڕێکخراوەکە توانیویەتی پەیوەندی باش و بەردەوام ببەستێت لەگەڵ کۆمەڵکاران کە تا دوای پرۆژەکانیش پەیوەندییەکان هەر بەردەوامن.
7. ڕێکخراوەکە سەر بە ژمارەیەکی تۆڕە، و لە زۆریان ڕابەرایەتی دەکات:

| ژ | ناوی چالاکی | سنووری کار | لایەنی هاوکار |
|---|---|---|---|
| 1 | | | |
| 2 | | | |
| 3 | | | |
| 4 | | | |
| 5 | | | |

8. بەشداری ڕێکخراوەکە لە چالاکییە نێودەوڵەتییەکان وەک بەشداری لە راپۆرتی ناوبەناوی گشتگیری (UPR) لە ژنێڤ.
9. بڕیاری ڕێکخراوەکە بۆ ڕووکردن بەرەو تایبەتمەندی لە ستراتیجەکەیدا دەبێتە مایەی تەرکیزی کۆششەکانی.

## خاڵەکانی لاوازی:

1. لاوازیی بایەخدان بە نیشاندەرەکانی هەڵسەنگاندنی سەرکەوتن و پێوانەکردنی کاریگەری هەر ئامانج و پلانێک.
2. لاوازیی توانای ڕێکخراوەکە لە گەیشتنی ئازادانە و ڕاستەوخۆ بە توێژە زیانپێکەوتووەکان لە کاتی قەیرانەکاندا.
3. لاوازیی توانای دارایی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی کارەسات و حاڵەتی ناکاوی.
4. لاوازیی حەشدکردنی توانای خۆبەخشەکان بە تەواوەتی.
5. لاوازیی فیدباکی ستراتیجی و بەڵگەکردن. (توثیق).
6. لاوازیی بەدواداچوون پاش تەواوبوونی بەرنامە و پرۆژەکان.
7. لاوازیی ئەوپەڕی سوود وەرگرتن لە ئامرازە تەکنەلۆجییەکان.

## ژینگەی دەرەکی:

### دەرفەتەکان:

1. دەرفەت هەیە بۆ جەخت خستنە سەر پرۆژەی ئاشتی و ئاشتەوایی نیشتمانی و بڵاوکردنەوەی هۆشیاری مەدەنی لەلای کۆمەڵگە و ئاخاوتن لەگەڵ کۆمەککاران بۆ تەمویلی پرۆژەی لەم جۆرە
2. دەرفەت هەیە بۆ پێکهێنانی هاوبەشیی ڕاستەقینە لەگەڵ ڕێکخراوەکانی تر بۆ چاکترکردنی دەرفەتی کێبڕکێ و زیادکردنی فشار
3. دەرچوونی لەسەرخۆی عێراق لە پابەندێتییەکانی لە بەرامبەر ماندات و سزا نێودەوڵەتییەکان دەرفەتێکی گەورە دەبێت بۆ پرۆسەی گەشەسەندن و بەشداریی دەستگاکانی کۆمەڵگەی مەدەنی تێیدا بە کارایی.
4. ئاڕاستەی ئاژانسەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و ڕێکخراوە ناحکومیە نێودەوڵەتییە گەورەکان بۆ تەمویلی بەرنامەکانی ڕێکخراوە ناحکومییەکان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ.

ئاستەنگەکان:

1. کەمیی هۆشمەندی سەبارەت بایەخی دەستگاکانی کۆمەڵگەی مەدەنی هەڕەشەیە بۆ سەر کەمیی بەشداریی کۆمەڵگەکە لە دەستنیشانکردنی پێویستییەکان و جێبەجێکردنی بەرنامەکان
2. ئەگەری کەمبوونەوەی تەمویل و ڕاوەستانی هەندێک ڕێکخراو لە ئەنجامی هەڵسەنگاندنی چالاکییەکانیان لە عێراق
3. ڕەوشی ئاسایش و کێشەی تایەفەگەری.
4. هەوڵدان بۆ بە سیاسیکردن و حزبایەتیکردنی ڕێکخراوەکان.
5. زەحمەتیی تایبەتمەندێتیی ڕێکخراوەکان.
6. زەحمەتیی بەدەستهێنانی زانیاری.

7. بەردەوامیی تەحەفوزی حکومەتی عێراق لەسەر هەندێک ڕێککەوتننامەی نێودەولەتی.
8. کۆنترۆڵی هێزە تەقلیدییەکان بەسەر بیروبۆچوونی خەڵک، ئەمەش کاری ڕێکخراوە ناحکومییەکان زەحمەت دەکات

## پارێزگاریی لە خێزان و منداڵان

**هەڵبژاردنی ناونیشانی (پارێزگاریی لە خێزان و منداڵان) وەک تایبەتمەندییەک بۆ کاری ڕێکخراوەکە لە قۆناغی داهاتوودا لەبەر ئەم هۆیانە:**

1. هەڵسەنگاندنی کاری سالانی ڕابردوو ئەوە دەردەخات کە نیشاندەری ڕێکخراوەکە بەرەوپێش چووە لە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاریی مرۆیی بۆ خێزانەکان بە گشتیی و بۆ ژنان و منداڵان بە تایبەتی
   - ژمارەی سوودمەندان بە شێوەی ڕاستەوخۆ: 383218
   - ژمارەی سوودمەندان بە ناڕاستەوخۆ : 71 ڕێکخراو

## گروپی سوودمەند:

| منداڵ | ژن | لاو | زیندانی | مرۆڤ، بە گشتیی |
|---|---|---|---|---|
| %36 | %35 | %2 | %1 | %26 |

2. کەڵەکەبوونی پسپۆڕی لەم بوارەدا لەلای کادر و خۆبەخش.
3. هەبوونی پەیوەندییەکی پتەو لەگەڵ کۆمەککاران لەم بوارەدا.
4. هەبوونی هاوبەش لە دەستگا فەرمییەکان و ڕێکخراوەکانی تر کە پشتگیری ئەم بوارە دەکەن.
5. کەمیی ژمارەی ئەو ڕێکخراوانەی لەم بوارەدا کار دەکەن بە بەراورد لەگەڵ قەبارەی کێشەکە.

ڕێکخــراوەکە ئامــانجە ســەرەکییەکەی خــۆی لە پلانــی ســتراتیجیدا دارِشـتووە بە گوێرەی ئامـانجەکەی لە دووتـوێی پەیرِەوی نـاوخۆی کۆنگرەکەدا:

**ئامانج**: پتەوکردن و پیادەکردنی پرەنسیپەکانی مافی مرۆڤ لە رێی پـرۆژەی گەشەســەندنی بەردەوام، لە پێنــاو بنیاتنــانی ئاییـندەیەکی باشتر.

**ئامـانجی گشـتیی**: کـارکردن بـۆ پارێزگـاریی لە خێـزان و منـداڵ وەک بەشێک لە پیادەکردنی پرەنسیپەکانی مافی مرۆڤ.

لەبەرئەوەی ناونیشـانەکە (پارێزگـاریی لە خێـزان و منداڵ) پێویسـتی بەوەیە کە بوارەکــانی ڕوون بکەیــنەوە بە شــێوەیەکی تێروتەســەل، بۆیە ئەم تەوەرە سەرەکییانە دەستنیشان کراوە:




لقەکــان و بوارەکــانی هەر تەوەرێــک لەنــاو پلانــی ســتراتیجیی ڕێکخراوەکەدا ڕوون کراوەتەوە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

## پارێزگاریی یاسایی:

**ئامانجی لاوەکیی 1: بنیاتنانی ژینگەیەکی گونجاوی یاسایی بۆ خێزان و منداڵانی عێراق.**

بـۆ بەجێهێنـانی ئامـانجی یەکەم دەتوانرێـت ئەم بەرنـامە و پـرۆژانە جێبەجێ بکرێت:

1. فشار بۆ چەسپاندنی ئازادییە گشتیی و تایبەتییەکان.
2. فشـار بـۆ دەرکردنـی یاسـای پاراسـتنی منـداڵ، و دەسـتکاریی یاساکانی تر تا بگونجێن لەگەڵ پێوەرە نێودەوڵەتییەکان.
3. فشار بۆ چالاککردنی یاساکانی دژایەتی توندوتیژی و جیاکاری دژی ژنان.
4. لێکۆڵینەوە و جێبەجێکردنی بەرنامە و پرۆژە بۆ سنووردانان بۆ توندوتیژی ناو خێزان.
5. درێژەدان بە کار بۆ پارێزگاریی یاسایی توێژە نەدارەکان.
6. دادپەروەریی بۆ نەوجەوانان.
7. دادپەروەریی بۆ زیندانیان.
8. بڵاوکردنەوەی رۆشنبیریی یاسایی

## پارێزگاریی کۆمەڵایەتی و تەندروستیی:

**ئامانجی لاوەکیی2 :کارکردن بۆ چاکترکردنی رەوشی کۆمەڵایەتیو تەندروستی.**

**بۆ بەدیهێنانی ئامانجی دووەم دەتوانرێت لەم بوارانەدا پرۆژە و بەرنامانە جێبەجێ بکرێت:**

1. جێندەر.
2. کارکردنی منداڵان، و بازرگانیکردن بە مرۆڤەوە.
3. مافی خوێندن و بنبڕکردنی نەخوێندەواری.
4. خەتەنەکردنی ژنان.
5. ئایدز و ئاڵوودەبوون بە مادەی هۆشبەر.
6. قەیرەیی و بێوەژن و هەتیو.
7. ئازادیی هەڵبژاردنی هاوسەر.
8. کۆچی نایاسایی.
9. هۆشیاریی کۆمەڵایەتی و تەندروستی.

## پارێزگاریی ئابووری:

**ئامانجی لاوەکی: چاکترکردنی ژیانی خێزانەکان لە بواری ئابوورییەوە لە ڕێی دەرفەتی یەکسانەوە.**

بۆ بەدیهێنانی ئامانجی سێیەم دەتوانرێت لەم بوارانەدا پرۆژە و بەرنامە جێبەجێ بکرێت:

1. مافی کار.
2. ئاسایشی خۆراکی.
3. مافی هاووڵاتی لە سامانەکانی وڵات.
4. دروستکردنی داهات، و مەشقی پیشەیی.
5. پارێزگاریی لە بەکاربەر.
6. شەفافییەت و دژەگەندەڵی.

## میكانیزمەكانی كار:

1. هۆشیاركردنەوە.
2. مەشق و ڕاهێنان.
3. لێكۆڵینەوە و توێژینەوە.
4. داكۆكی و فشار.
5. چاودێری و بەرزكردنەوەی ڕاپۆرت.

## جێبەجێكردنی پلان،

بەڕێوەبردنی سەرچاوەكان، بەدواداچوون وچاودێری، هەڵسەنگاندن

## جێبەجێكردنی پلان:

ڕێكخراوەكە پشت دەبەستێت بە پلانی كاری ساڵانە، كە لە سەرەتای ساڵی داراییەوە دەست پێدەكات و لەگەڵی كۆتایی دێت. پلانی ساڵانە لە میانی كۆبوونەوەكانی نووسینگەكانی ڕێكخراوەكە لەگەڵ خۆبەخشان، دادەڕێژرێت، ئنجا ڕەوانە دەكرێت بۆ بەشی بەرنامەكان و سەرچاوە مرۆییەكان تا یەكیان بخەن و پێویستییەكانیان بۆ دابین بكەن.

**پلانی ساڵانە پشت بە سێ سەرچاوە دەبەستێت لە بواری جێبەجێكردندا:**

1. ئەو چالاكییانەی دەتوانرێت بە توانای خود جێبەجێ بكرێن.
2. ئەو چالاكییانەی دەتوانرێت لەگەڵ هاوبەش جێبەجێ بكرێن.

3. ئەو چالاکییانەی دەتوانرێت لە ڕێی پێشکەشکردنی پرۆژە بۆ لایەنە کۆمەککارەکان جێبەجێ بکرێت.

ئەم پلانە ساڵانە پێداچوونەوە و هەڵسەنگاندنی دەکرێت، و پلانێکی نوێ بە هەمان میکانیزم بۆ ساڵی داهاتوو دادەڕێژرێت، بە مەبەستی جێبەجێکردنی پلانی سێ ساڵەی ستراتیجی.

## سەرچاوە مرۆییەکان:

سەرچاوە مرۆییەکان: ژمارەیەکی زۆر خۆبەخش لەگەڵ ڕێخکراوەکە کار دەکەن، سەرەڕای چەند کارمەندێک بە گرێبەست لە بەشە جۆراوجۆرەکانی ڕێکخراوەکەدا. ساڵی ٢٠٠٩ ژمارەی کارمەندان گەیشتە ٧٣ کەس و ژمارەی خۆبەخشان گەیشتە ١٤٦. بە سێ شێواز سەرچاوە مرۆییەکان بەڕێوە دەبرێت، وەک:

1. کارمەند بە گرێبەست: پۆستەکە وەک دەرفەتی یەکسان ڕادەگەیەرێت و چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو کەسانە دەکرێت کە سی ڤییان پێشکەش کردووە، پاشان گرێبەستیان لەگەڵ دەکرێت و ماف و ئەرکەکان و وەسفی وەزیفیان بۆ ڕوون دەکرێتەوە.
2. خۆبەخش: هەموو هاووڵاتییەک مافی هەیە فۆرمی خۆبەخشی پڕ بکاتەوە، لە ڕێی ئاوێتەکردنی خۆبەخشەکانەوە لە بەرنامە و پرۆژە خێرخوازییەکاندا سوود لە تواناکانیان وەردەگیرێت.
3. خولی ڕاهێنان بۆ کارمەندانی گرێبەست و خۆبەخشان ساز دەکرێت بۆ مەشقپێکردنیان و ئاشناکردنیان بە پرەنسیپ و بەهاکانی ڕێکخراوەکە، سەرەڕای بواری کارەکەیان.

**سەرچاوە داراییەکان: ڕێکخراوەکە کار دەکات بۆ ئەوەی خۆی کاروبارە داراییەکانی خۆی بەڕێوە ببات، و کار دەکات بۆ دابینکردنی سەرجەم پێویستییەکانی کار لە ژینگەی کاردا بۆ کارمەندان، و پارە بە شێوازی جۆراوجۆر بۆ پرۆژەکان تەرخان دەکات. وەک:**

1. بە هاوبەشیی لەگەڵ ڕێکخراوەکان و لایەنە کۆمەککارەکانی پرۆژەکان.
2. حساباتی پرۆژەکە دەخرێتە ژێر چاودێری و پاش کۆتایی ساڵی دارایی، بڵاودەکرێتەوە.
3. بودجەیەکی مەزەندەکاری بۆ ساڵەکە دادەنرێت، بۆ داپۆشینی خەرجییەکانی کارەکان.
4. حسابێکی بانک دەکرێتەوە و سیستمی دارایی پیادە دەکرێت.

## بەدواداچوون و چاودێری:

لە ڕێی ئەم میکانیزمانەی خوارەوە بەدواداچوون چاودێری ئەنجام دەدرێت:

1. ناردنی ڕاپۆرتی مانگانە بۆ نووسینگەکان و راپۆرتی وەرزی و ساڵانەی دارایی، سەرەڕای ڕاپۆرتی تایبەت بە جێبەجێکردنی پرۆژەکان.
2. سازدانی کۆبوونەوەی مانگانە لە لایەن دەستەی کارگێڕییەوە، و سازدانی کۆبوونەوەی بەرفراوانی ساڵانە و کۆبوونەوەی تایبەت لەگەڵ بەڕێوەبەری نووسینگەکان و پرۆژەکان.

3. سەردانی مەیدانی بۆ نووسینگە و پرۆژەکان.
4. بەڵگەنامەکردن (توثیق)ی چالاکییەکان بە شێوازی جۆراوجۆر، بۆ نموونە وێنەگرتن بە ڤیدیۆ، کامێرا.
5. درێژەدان بە پەیوەندیی لەگەڵ هاوبەشەکان و کۆمەککارەکان و سوودمەندان و لایەنە پەیوەندارەکان بۆ بەدواداچوونی کارەکان.

## هەڵسەنگاندن:

هەڵسەنگاندن بەشێکی گرنگە لە پرۆسەی پێداچوونەوە و هەڵسەنگاندنی کار و ڕاستکردنەوە، ئەمەش بە شێوازی جۆراوجۆر دەکرێت:

### یەکەم: کۆبوونەوە

6. کۆبوونەوە سەبارەت بە پرۆژەکان: لە کۆتایی هەر پرۆژەیەکدا کۆبوونەوەیەکی هەڵسەنگاندن دەکرێت لەگەڵ لایەنە پەیوەندارەکانی پرۆژەکە بە مەبەستی هەڵسەنگاندنی کارەکان.
7. کۆبوونەوەی سالانە: کۆبوونەوەی سالانە بۆ هەڵسەنگاندنی کارەکانی ساڵاکە و پلاندانان بۆ ساڵی داهاتوو ساز دەکرێت، بە ئامادەبوونی سەرجەم سەرکردایەتییەکانی ڕێکخراوەکە.
8. کۆنگرەی ڕێکخراوەکە: سێ ساڵ جارێک کۆبوونەوەی گشتیی ڕێکخراوەکە دەبەسترێت و هەموو ئەندامان ئامادە دەبن، بە مەبەستی پێداچوونەوەی پلانی ستراتیجی.

## دووەم: هەڵسەنگاندن بە بەشداریکردن.

پرۆسەی هەڵسەنگاندن بە بەشداریکردن بریتییە لە بەشداریکردنی لایەنە پەیوەندیدارەکان و سوودمەندەکان لە ڕێی کۆبوونەوە، فۆرم، یان بەشداریی لە کۆبوونەوەی تایبەت بە پرۆژەکە.

## سێیەم: هەڵسەنگاندنی دەرەکی

ڕێکخراوەکە جۆرێکی تر لە هەڵسەنگاندن بەکاردەهێنێت کە بریتییە لە هەڵسەنگاندنی دەرەکی، واتە داوا لە دەستگایەکی دەرەکی دەکرێت سەرجەم کارەکان یان هەندێک لە کارەکان یان پلانی ستراتیجی هەڵبسەنگێنێت.

# چاپتەری چوارەم

## پلانی جێبەجێکاری بۆ ماوەی یەک ساڵ

ڕێکخراوی .............................................
پلانی کاری ساڵانە
2011

<u>ئامانجی گشتیی: العام : کارکردن بۆ پارێزگاری لە خێزان و منداڵوەک بەشێک لە پرەنسیپی مافەکانی مرۆڤ.</u>

ڕێکخراوەکە پشت دەبەستێت بە پلانی کاری ساڵانە بە گوێرەی پلانی ستراتیجی ۲۰۱۱-۲۰۱۳، کە لە سەرەتای ساڵی داراییەوە دەست پێدەکات و لەگەڵی کۆتایی دێت. پلانی ساڵانە لە میانی کۆبوونەوەکانی نووسینگەکانی ڕێکخراوەکە لەگەڵ خۆبەخشان، دادەڕێژرێت، ئنجا ڕەوانە دەکرێت بۆ بەشی بەرنامەکان و سەرچاوە مرۆییەکان تا یەکیان بخەن و پێویستییەکانیان بۆ دابین بکەن.

**پلانی ساڵانەی ڕێکخراوەکە و نووسینگەکانی ....... پشت بە سێ سەرچاوە دەبەستێت لە بواری جێبەجێکردندا:**

1. ئەو چالاکییانەی دەتوانرێت بە توانای خود جێبەجێ بکرێن.
2. ئەو چالاکییانەی دەتوانرێت لەگەڵ هاوبەش جێبەجێ بکرێن.
3. ئەو چالاکییانەی دەتوانرێت لە ڕێی پێشکەشکردنی پرۆژە بۆ لایەنە کۆمەککارەکان جێبەجێ بکرێت.

پارێزگاری لە خێزان و منداڵان

پارێزگاریی یاسایی

**ئامانجی لاوەکیی 1: بنیاتنانی ژینگەیەکی یاسایی گونجو بۆ خێزان و منداڵانی عێراق**

**بۆ بەجێهێنانی ئامانجی یەکەم دەتوانرێت ئەم بەرنامە و پرۆژانە جێبەجێ بکرێت:**

1. فشار بۆ چەسپاندنی ئازادییە گشتیی و تایبەتییەکان.
2. فشار بۆ دەرکردنی یاسای پاراستنی منداڵ، و دەستکاریی یاساکانی تر تا بگونجێن لەگەڵ پێوەرە نێودەوڵەتییەکان.
3. فشار بۆ چالاککردنی یاساکانی دژایەتی توندوتیژی و جیاکاری دژی ژنان.
4. لێکۆڵینەوە و جێبەجێکردنی بەرنامە و پرۆژە بۆ سنووردانان بۆ توندوتیژی ناو خێزان.
5. درێژەدان بە کار بۆ پارێزگاریی یاسایی توێژە نەدارەکان.
6. دادپەروەریی بۆ نەوجەوانان.
7. دادپەروەریی بۆ زیندانیان.
8. بڵاوکردنەوەی رۆشنبیریی یاسایی

| ناوی پرۆژە یان چالاکی | چالاکییەکانی جێبەجێکردنی پرۆژە | دەرکردەکان یان ژ. سوودمەندەکان | ماوەی زەمەی | بودجەی مەزەندەکراو | لایەنی کۆمەککار | پارێزگا، شوێن |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| | | | | | | |
| | | | | | | |
| | | | | | | |

پارێزگاریی لە خێزان و منداڵان

پارێزگاریی کۆمەڵایەتی و تەندروستی:

**ئامانجی لاوەکیی 2 : کارکردن بۆ چاکترکردنی ڕەوشی کۆمەڵایەتی و تەندروستی.**

بۆ بەدیهێنانی ئامانجی دووەم دەتوانرێت لەم بوارانەدا پرۆژە و بەرنامانە جێبەجێ بکرێت:

1. جێندەر.
2. کارکردنی منداڵان، و بازرگانیکردن بە مرۆڤەوە.
3. مافی خوێندن و بنبڕکردنی نەخوێندەواری.
4. خەتەنەکردنی ژنان.
5. ئایدز و ئاڵوودەبوون بە مادەی هۆشبەرەوە.
6. قەیرەیی و بێوەژن و هەتیو.
7. ئازادیی هەڵبژاردنی هاوسەر.
8. کۆچی نایاسایی.
9. هۆشیاریی کۆمەڵایەتی و تەندروستی.

| ناوی پرۆژە یان چالاکی | چالاکییەکانی جێبەجێکردنی پرۆژە | دەرکردەکان یان ژ. سوودمەندەکان | ماوەی زەمەی | بودجەی مەزەندەکراو | لایەنی کۆمەککار | پارێزگا، شوێن |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | | |
| | | | | | | |
| | | | | | | |

## پارێزگاریی ئابووری:

**ئامانجی لاوەکی: چاکترکردنی ژیانی خێزانەکان لە بواری ئابوورییەوە لە رێی دەرفەتی یەکسانەوە.**

بۆ بەدیهێنانی ئامانجی سێیەم دەتوانرێت لەم بوارانەدا پرۆژە و بەرنامە

## جێبەجێ بکرێت:

1. مافی کار.
2. ئاسایشی خۆراکی.
3. مافی هاوولاتی لە سامانەکانی ولات.
4. دروستکردنی داهات، و مەشقی پیشەیی.
5. پارێزگاریی لە بەکاربەر.
6. شەفافییەت و دژەگەندەڵی.

| نـــاوی پـرۆژە یـــــان چالاکی | چالاکییەکانی جێبەجێکردنی پرۆژە | دەرکردەکـــان یــــــــان ژ. سوودمەندەکان | ماوەی زەمەی | بـــــودجەی مەزەندەکراو | لایەنـــی کۆمەککار | پارێزگا، شوێن |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | | |
| | | | | | | |
| | | | | | | |

**سەرنج:**

بۆ بەدیهێنـانی ئەم سـتراتیجە، پێویسـتە پشـت بە چەنـد میکـانیزمێکی کار ببەستین، وەک:

1- هەڵمەتی هۆشیاری.
2- مەشق و ڕاهێنانەوە.
3- لێکۆلینەوە و توێژینەوە
4- داکۆکی و فشار
5- چاودێری و بەرزکردنەوەی ڕاپۆرت.

